ناوی کتێب: نیشتمان و وولاتە پێشکەوتووەکانی ناو بەهەشت
نووسینی: د. شـــکـار عـــــەزیـز
دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنـــوێن
دیزاینی تێکست: زەردەشــت کاوانی
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣
چـــاپ: نـاوەندی ڕێنـوێن
تیـــــراژ: (١٠٠٠) دانــــــە
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (     )ـی ساڵی (٢٠٢٣)ـی پێ دراوە.






**ناوەندی ڕێنوێن**


07511408868 - 07501269689

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)



- گەشتێک بەنــاو نیشتمــانەکانی مەملەکـەتی بەهـەشــتدا .
- وڵاتەکانی ناو مەملەکەتەکانی بەهەشت زۆر پێشکەوتوون لە ڕووی تەکنەلۆژیاوە، چونکە بە زانستی ناکۆتای پەروەردگار بونیادنراون .
- لەناو نیشتمانەکانی بەهەشتدا (هەم و خەم و غەم و خەفەت و بێتاقەتی و ترس و دڵەڕاوکێ و نەخۆشی و ناخۆشی ... هتد) بوونیان نیە، بەختەوەرەکانی ناو ئەو مەملەکەتانە بەهەمیشەیی لەخۆشی و ئارامیدا دەژین .

# پێشەکی

بسم الله، الحمدلله ، والصلاه والسلام علی من لا نبي بعده.

لە دوای خوێندنەوەو ورد بینییەکی ئەم کتێبەی بەردەستتان، کە برای بەرێز و بانگخوازی چالاکمان (دکتۆر شکار عەزیز) هەستاوە بە نووسین و کۆکردنەوەی لەسەر خۆشی و نازوو نیعمەتی ناو مەملەکەتەکانی بەهەشت، مرۆڤی ئیماندار ئاسوودە و دڵڕفێن دەکات و رۆحی ئیمانداران عاشقی لیقای ئەو مەملەکەتانە دەکات.

بێگومان ئێمەی ئیمانداران لەوەدا براوەین و هەمیشە دڵخۆش و گەشبینین، کە لە دوای ئەم دونیا پڕ لە نارەحەتی و نەهامەتییە، دونیایەکی دی دێتە پێش، - زۆر جیاوازتر لەم دونیا بچووک و کەم ماوەیە - کە پڕ لە خۆشی و ئاسوودەیی و نازو نیعمەت و لەهەموو گرنگتر گەیشتن بەو بەڵێنانەی الله تعالی لە دونیای کورت و کەم ماوەدا پێی دابووین.

بۆیە خوێندنەوەی ئەم کتێبەی بەردەستتان دڵ و ڕۆحەکان ئاسوودە دەکات و دڵ لە پەیوەندی و حەزی بۆ ئەم دونیا بچووک و کەم ماوەیە پەلکێش دەکات بۆ ئەو دونیا پڕ لە نازوو خۆشی و دوور لە هەموو ناخۆشییەک.

بۆیە وەک برای دڵسۆزمان کاک دکتۆر شکار لە سەرەتای کتێبەکەیدا ئاماژەی پێ دەکات بۆ ئەوەی ئاشنای سەرتاپای خۆشی

و شادییەکانی ناو مەملەکەتەکانی بەهەشت ببین، ڕەچاوی لاپەڕە بە لاپەڕەو بەش بەشی خوێندنەوەی کتێبەکە بن تا دەگەنە ئەو ئاست و قەناعەتەی کە بتانەوێ زۆر بەخێرایی بەرەو ئەو مەملەکەتانە بفڕن و لەوێ بە لیقای پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان شاد ببنەوە. وحسن أولئك رفيقا.

دوبارە دوعای خێرو سەرکەوتن و پاداشت لە خودا بۆ برام داواکارم.

عــیرفـان ئەحمەد کاکە مەحموود

سەرپەرشتیاری پڕۆژە بانگەوازییەکانی شێخ ئەحمەد کاکە مەحموود

سـلێـمــانــی

٢٨/ی ڕەجەبی ١٤٤٤ی کۆچی

٢٠٢٣/٢/١٩ ی میلادی.



## پێشەکی نوسەر

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على من لانبي بعده

خوێنەری بەرێزو هێژا: سەرەتا سوپاس و منەتباری پەروەردگاری جیهانەکانم کە هاوکاری کردم و توانیم بە پێنووسەکەم دووەم بەرهەمی نووسراوی خۆم بخەمە ناو کتێبخانەی کوردییەوەو هیوادارم توانیبێتم بەشێکی باش لە زادی خوێنەران و دۆستانی کتێب پڕ بکەمەوەو خوای گەورەش لێی وەرگرتبم و بەرەکەت بخاتە ناو بابەت و نوسراوەکانمەوە .

ئەوەی پێویستە لێرەدا بوترێ ئەوەیە کە دووەم بەرهەمم دەستم پێکردووەو پێنووسم لێ هەڵگرتووە ئەویش بابەتی: (گەشتێکی بێ وێنە بەناومەملەکەتەکان و نیشتمانەکانی بەهەشتدا)، لەبەر گەورەیی خۆشی ئەو مەملەکەتانە یاخود ئەو نیشتمانانەی ناو بەهەشتی گەورە بە پێویستم زانی لەسەر ئەو بوارە بنووسم و زۆر

بە وردی و بە جیاوازییەکی نوێو و سەرنج راکێشەوە تیشکم خستۆتە سەریان .

ئەوەی من لە ئێوەم دەوێت وەک نوسەری ئەم کتێبە تەنها دوعای خێرە و داوای بەدەستهێنانی فیردەوسی ئەعلام بۆ بکەن لە پەروەردگار.

جزاكم الله خيرا.

لێرەوە زۆر زۆر سوپاسی جەنابی (مامۆستا محمد مەلا فائیق شارەزووری) دەکەم کە هۆکاری نووسینی کتێبەکەم لە نووسراو و کتێبەکانی جەنابیانەوە سەری هەڵداوەو سەرچاوەی سەرەکی بابەتەکەم بووە .

**والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته**

**ڕوسیا / مۆسکۆ - ٢١/١/٢٠٢٣**



## كلیلی تێگەیشتن لەم كتێبە

**ئەم خاڵانە زۆر گرنگن پێش دەستپێكردن بە خوێندنەوە :**

١/ تۆ پێویستە بە ڕیزبەندی ئەم كتێبە بخوێنیتەوە واتە نابێ هیچ لاپەڕەیەكی لێ بپەڕێنی چونكە ڕووداو خۆشیەكانی ناو بەهەشتی مەزن یەك لەدوای یەكن و وابەستەی یەكترن

٢/ سروشتی ئەم كتێبە بەجۆرێكە كە دەستتكرد بەخوێندنەوەی (٣) لاپەڕەی یەكەم ئەوا حەزدەكەیت تا كۆتایی بەردەوام بیت

٣/ ئەم كتێبە بەشێوازێك داڕێژراوەو خۆشی ڕووداوەكانی ناوی بەجۆرێك نوسراوەتەوە وەك ئەوەی تەماشای درامایەك بكەیت یان كتێبێكی ڕۆمان بخوێنیتەوە چێژ لە هەنگاوەكانی ناو بەهەشت وەربگریت ، وات لێدەكات ئارەزوو بكەیت بزانیت چۆنەو چ چێژێك دەگەیەنن بە دڵ و دەروون و مێشك

٤/ لەم كتێبەدا خۆشیەكانی ناو بەهەشت تێهەڵكێشی چەندین بواری زانستی و فیزیایی و پزیشكی تەكنەلۆژیایی سەردەمی نوێ كراوە چەندین نمونەی تیادانراوە بۆ تێگەیشتنی ئاسان لە پێشكەوتوویی ناو بەهەشت و نازو نیعمەتەكانی ناوی

٥/ ئەم كتێبە بە زمانێكی ئاسان نوسراوەتەوە كە هەموو ئاستێكی كۆمەڵگا دەتوانێت بەئاسانی لێی تێبگات و چێژ لە ڕووداو خۆشیەكانی ناوی وەربگرێت

٦/ ئەم کتێبە زۆر بەسودە بۆ ئەو کەسانەی کە خەم و خەفەت و نارەحەتی و مەئیوسی و بێزاری ئێخەی گرتوون و بێ هیوا بوون لە ژیانیان ، بۆچی ؟ چونکە بەخوێندنەوەی ئەم کتێبە تۆ واقعی خۆت لەناو ئەم جیهانە مەزنەدا دەدۆزیتەوە و بەئیزنی خوای گەورە پاش خوێندنەوە ژیانێکی نوێ دەست پێ دەکەیت بەجۆرێک

گۆڕانی تەواوەتی لەهەموو ژیان و تەمەنتدا ڕوودەدات چونکە ئاشنات دەکات بە خۆشیە ناوازەکانی ناو ئەو وڵات و مەملەکەتانەی ئەوێ

٧/ لەم کتێبەدا چەند وێنەیەکی دونیام داناوە تەنها بۆ چێژبینین و بەراوردکرنی دونیا بەبەهەشت لەکاتێکدا دونیا هێندەی باڵە مێشولەیەک نرخی نیە لەچاو مەملەکەتەکانی ناو بەهەشتدا

٨/ ئەوەی من لە ئێوەم دەوێت وەک نوسەری ئەم کتێبە تەنها دوعای خێرە و داوای بەدەستهێنانی فیردەوسی اعلام بۆ بکەن لە پەروەردگار جزاکم الله خیرا والسلام علیکم .



## بزانە تۆی مرۆڤ روبەرووی چوار جیهانی جیاواز دەبیتەوە تا دەگەیتە مەنزڵگە!



سەرنج بدەن لەم وتانەو بیری لێبکەنەوە :

### جیهانی یەکەم : جیهانی ناو رەحمی دایک ( جیهانی ناو منداڵدان)

تۆ لەناو ڕەحمی دایکتدا بوویت بەتەنیا خواردن و خواردنەوەو هەموو پێویستیەکت لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ دابینکرابوو بەهۆکاری دایکت بۆ ماوەی ٩ مانگ ، پاشان لەو شوێنە بچوک و تەسکەدا هاتیتە دەرەوەو تێکەڵ بوویت بە شوێنێکی ئێجگار فراوان و گەورە کە ژیانی دونیایە ، پاشان تێکەڵ بوویت بە ملیۆنەها مرۆڤی هاوشێوەی خۆت کە هەموویان پێڕی سەدەیەکن و تەمەنیان بەگشتی لەنێوان یەک ساڵ بۆ ١٠٠ ساڵە .

**تێبینی:** بۆ شارەزابوون لەم جیهانە کتێبی زانستی کۆرپەلەزانی (embriology) بخوێنەرەوە .

### جیهانی دووەم : جیهانی ژیانی دونیا

لەم جیهانەدا تۆ بۆ تەمەنێکی دیاریکراو وە لەسەردەم و سەدەیەکی دیاریکراودا دەژیت ، بە سێ قۆناغی تەمەن و ژیانتدا گوزەردەکەیت :

١- تەمەنی منداڵی کە ( نە عەقڵ پێگەیشتووە ، نە لاشە پێگەیشتووە)

٢- تەمەنی لاوێتی کە ( لاشە لە تەمەنی ٣٣ساڵیدا دەگاتە پێگەیشتنی تەواو بەڵام عەقڵ هێشتا لە گەشەسەندندایە )

٣- تەمەنی پیری (لەدوای تەمەنی ٣٣ ساڵیەوە لاشە بەرەو لاوازبوون دەروات و عەقڵیش لەتەمەنی ٤٠ ساڵی دەگاتە ئەوپەڕی گەشەکردن)، پاش ئەم تەمەنە لاشەو مێشک بەرەو پوکانەوەو بچوکبوونەوە دەرۆن و تا دەگەیتە قۆناغێک کە ئامێرەکانی لاشەت لاوازدەبن لە کارکردن و بەمەش تۆ وەفات دەکەیت واتە نەقڵ دەبیت لە جیهانی ژیانی دونیاوە بۆ جیهانی سێیەم کە پێی دەڵێن جیهانی بەرزەخ .

**تێبینی:** بۆ شارەزابوونی زیاتر لەم جیهانە (ژیانی دونیا) کتێبی نیشانەکانی رۆژیی دوای بخوێنەرەوە .

## جیهانی سێیەم : جیهانی بەرزەخ

تۆ کە وەفات دەکەیت لەژیانی دونیاوە دەگوازرێیتەوە بۆ ژیانێکی ئێجگار فراوانتر و گەورەترو بەرینتر کە هەموو مرۆڤەکانی تیایە لە ئادەمەوە تا ئەو کەسەی کە لەپێش تۆوە نەقڵ بووە ، هەموویان دەبینیت و ژیانێکی جیاوازەو ئێجگار فراوانترە لە جیهانی ژیانی دونیا (کاتەکەشی زۆر درێژخایەنترە لەو کاتەی کە لەدونیادا هەیە) وە رووبەرووی چەند دیاردەو چەند رووداوێک دەبیتەوە لەو جیهانەدا ، پاشان تۆ لە جیهانی بەرزەخەوە دەگوازرێیتەوە بۆ جیهانی چوارەم واتە جیهانی قیامەت (رۆژی زیندووبوونەوە و هەستانەوە ، جیهانی دادگایی سەرجەم زیندەوەران).



**تێبینی:** لە کتێبی جیهانی بەرزەخ بەوردەکاری باسی ئەو جیهانەو ڕووداوەکانی ناوی کراوە .

## جیهانی چوارەم : ژیانی ڕۆژی هەستانەوەو دادگا

ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤەکان زیندوو دەبنەوە هەڵدەستنەوە ، زۆر زۆر درێژخایەنترەو فراوانترو گەورەترە لە سێ جیهانەکەی تری وەک ( جیهانی منداڵدانی دایک ، جیهانی دونیا ، جیهانی بەرزەخ ).

ئەو بابەتانەی هەموو ژیان و بیرکردنەوەو تێڕوانینتان دەگۆڕێت! کورتەی باسەکان لەم چەند خاڵەدا خۆی دەبینێتەوە:- ئایا لەسەرەتای دەستپێکردنی یەکەم ڕۆژی هەستانەوە لە گۆڕدا چی ڕوودەدات ؟ ئایا نەقڵ بوونی مرۆڤ لە جیهانی بەرزەخ بۆ جیهانی دادگای ئیلاهی چۆن دەبێت؟

**١** / ئایا ئەو گۆرانە سروشتیانە چین و چۆنن کە بەسەر ئاسمانەکان و زەوی و مانگ و خۆر و ئەستێرەو هەسارەکاندا دێت ؟ لە یەکەم مرۆڤەوە تا کۆتا مرۆڤ بەدرێژایی هەموو سەردەم و سەدەکان .

**٢** / ئایا شێوازو جۆری ئەو بارانە چۆنە کە بەر خانەکانی ئێسکی کلێنچکە دەکەوێت؟ ئایا چۆن دیسان لەو کۆمەڵە خانەیەوە کە لە شێوەی دەنکە نیسکێکدایە هەموو شانەو خانەکانی لەشی مرۆڤەکان دەست بەدابەشبوون و دروستبوونەوە دەکەن؟

**/٣** ئایا مرۆڤەکان کە لاشەیان دروست بۆوە لەو گۆڕەدا بەهۆی ئەو بارانە تایبەتیەوە چۆن ڕۆحەکان دەگەڕێنەوە بۆ ناو ئەو

لاشانە ؟ ئایا چۆن پاش گەیشتنەوەی ڕۆح و لاشە بەیەکتر مرۆڤەکان هەڵدەستنەوە لەناو گۆڕەکانیاندا ؟

٤/ ئایا شێوازی ئەم لاشە نوێیە چۆنەو مرۆڤەکان قەبارەو باڵایان چۆنەو چەندە لەو ڕۆژەدا؟ ئایا خەتەنە کراون یان نا؟ ئایا ڕووتن و بێ جل و بەرگن یان نا؟! چەندین زانیاری تری سەرنج ڕاکێشی تر لە کتێبی (قیامەت ڕووداوەکان و گۆڕانکاریەکان) بخوێنەرەوە.!!!

٥/ ئایا کاتێک کە مرۆڤەکان هەڵدەستنەوە یەکەم شت چی دەبینن؟ چۆن دونیا دەبینن ؟ کە گۆڕاوەو خۆریش زۆر نزیک بۆتەوەو وە ئەو زەوییەی لەسەرین چۆنە ؟

٦/ ژمارەی مرۆڤەکان ملیارەها مرۆڤن لەو ڕۆژو جیهانەدا چونکە لەیەکەم مرۆڤەوە تا کۆتا مرۆڤ زیندوو بوونەتەوەو بە قەومی یەئجوج و مەئجوجەوە بە هەموو جنەکانەوە لەو ڕۆژەدا ئامادەی ئەو شوێنە تایبەتیەی ژیانی قیامەتن بۆ لێپرسینەوە ؟ ئایا مرۆڤەکان جنەکان دەبینن یان نا ؟

٧ / ئایا عائیلەو ماڵ و خێزان لەو ڕۆژەدا حاڵیان چۆنە ؟ ئایا منداڵێک کە لەمنداڵیدا باوکی یان دایکی مردووە پێیان شاد دەبێتەوە لەو ڕۆژەدا ؟ ئایا هەموو دۆست و خۆشەویستان بەیەکتر دەگەنەوە؟ ئایا لەو ڕۆژەدا هەموو تاکێکی مرۆڤ دەبنە دوژمنی یەکتر یان نا ؟ چۆن دەبێت ؟



٨/ ئایا لەو ڕۆژەدا کەسانێک لەمرۆڤەکان هەن تایبەتکراوبن و ڕێزلێگیراو بن و خواردن و خواردنەوەو پۆشاکی تایبەتیان پێ بەخشرابێت ؟

٩ / ئایا جۆرو شێواز و ژمارەی ئەو فریشتانە چەندەو چۆنە کە هەموو مەخلوقات لەو ڕۆژەدا بەڕێوە دەبەن و جیایان دەکەنەوەو ڕێکیان دەخەن و ئامادەیان دەکەن بۆ لێپرسینەوە و دادگایی کردن؟ ئایا تەرازووە گەورەو سەرنج ڕاکێش و ناوازەکان چۆنن و چەنێ پێشکەوتوون ؟

١٠ / ئایا هەموو زوڵمێک کە کراوە لەنێوان مرۆڤەکاندا چۆن حەق بۆ خاوەن حەق دەگێڕدرێتەوەو چۆن زاڵم و ستەمکار حەقی زوڵمەکەی لێ دەسێنرێتەوە ؟ ئایا چۆن دادگایی نێوان مرۆڤەکان بەڕێوە دەبرێت و جێبەجێ دەکرێت ؟

١١ / ئایا لەو ڕۆژەداو لەو ژیانە درێژخایەنەدا کە قەرەباڵغترین جیهانەو هەرچی مەخلوقاتە تیایدا ئامادەی حەق و حساب کراوە ئایا چ تەکنەلۆژیایەکی ئیلاهی تیایە هەر لە شاشەو پیشاندانەوەی دەنگ و ڕەنگەکان (چونکە وزە لەناو ناچێت) و ئایا ژیانی جن و مرۆڤەکان لە دونیادا چۆن پەخش دەکرێتەوە ؟ ئایا ئامێرە پێشکەوتووەکانی ناو ئەو جیهانە چۆنن کە بەکاردەهێنرێن بۆ جیاکردنەوەی خراپەکاران لە چاکەکاران؟

١٢/ ئایا چۆن جەهەنەم دەهێنرێت و ئامادە دەکرێت ؟ ئایا چۆن پردێکی گەورە بەسەر دۆزەخدا دروست دەکرێ بۆ پەڕینەوە بۆ

ژیانە هەتا هەتاییەکەی بەهەشت؟ ئایا لە شوێنە تاریکاییەکاندا مرۆڤەکان چۆن ڕوناکیان دەست دەکەوێت بۆ ڕێگا تاریکەکان و ڕزگاربوونیان لێی ؟!

**١٣/** ئایا پردی سیڕات لە دەمی شمشێر تیژترە؟ بەڵێ چۆن؟ زۆر بەزانستی و لۆژیکی!

**تێبینی:** بۆ وەڵامی ئـەم پرسـیارانەو چەندین پرسـیارو بابـەتی سەرنجراکێشی تر خـوێنەری کتێبی (قـیامـەت ڕووداوەکان و گۆڕانکاریەکان) بن.

پێش هەموو شتێک تۆ پێویستە ئەمـانە بزانیت بەتـەواوی و بەتێگەیشتنەوە پاش ئەوە بڕیاربدەیت کە باوەڕت پێی هەیە یان نا، وە ئەگەر باوەڕیشت پێی نەبوو پێویستە بەدیلت هەبێ بۆ غەیری ئەم بابەتە ئیمانی وغەیبیانە.

لەدوای ئەم جیهانە تۆ دەگەیت بە جیهانی ژیانی هەتاهەتاییت (مەنزڵگەی کۆتاییت) کە یان ڕەوانەی بەهەشت و ژیانە پڕ لە نازو نیعمەتەکان دەکرێی، یاخود پەنا بە پەروەردگار بەرەو زیندانەکانی دۆزەخ و ئاگرەکەی ڕەوانە دەکرێیت .

**تێبینی:** لە کتێبی (قیامەت ڕووداوەکان و گۆڕانکاریەکان) جیهانی هەستانەوەو دادگاکان بەوردەکاری باسکراوەو ڕوونکراوەتەوە .



## جیهانی هەتاهەتایی کۆتا مەنزڵگە
## جیهانی ژیانی ناو مەملەکەتەکانی بەهەشت



جیهانی وەستان لە نەقڵ بوون و گواستنەوە

جیهانی کۆتایی هاتن بە مردن

جیهانی نوقووم بوون لە خۆشی و نیعمەتەکان

گەشتێکی بێ وێنە بەناومەملەکەتەکان و نیشتمانەکانی بەهەشتدا

### وردەکاری سات بە ساتی ژیانی ناوبەهەشت (ژیانی هەمیشەیی پاداشت)

بەکورتی چەند خاڵێک لەسەر جیهانی بەهەشت :

### ئایا بەهەشت بەوردەکاری چۆنەو لە چی دروست بووەو وە چی تیایە ؟

ئایا پەروەردگار مرۆڤێک دروست بکات توانای دروستکردنی ئەم تەکنەلۆژیایەی ئەمرۆی دونیای هەبێت ئەی خودی زاتی گەورەیی خۆی چ پێشکەوتنێکی دروست کردووە لەناو بەهەشتدا ؟

لەگەڵ چەندەها زانیاری و بابەتی گرنگ و سەرنج راکێشی تر کە پێشتر نەتانبیستووە لەسەر ناو بەهەشت و دروستکراوەکانی .

بەهەشت هەتاهەتاییە واتە لەوێوە نەقڵبوون نیە ( مردن نیە ) بەمانایەکی تر گواستنەوە نیە لە جیهانێکەوە بۆ جیهانێکی تر و ژیانێکی تر چونکە کۆتا مەنزڵگەیە ژیان تیایدا هەتا هەتاییە

## دیمەنە پێشکەوتووەکانی ناو بەهەشت :

بەهەشت دیمەنی پێشکەوتووی وای تێدایە کە پێشکەوتنی سەردەمی ئەمرۆمان هیچ نیە لەچاویدا چونکە ئەوەی لەو جیهانەدا هەیە نە چاو بینیویەتی نە گوێ بیستوویەتی نە بە خەیاڵ و ختورەش بەدڵی کەسدا هاتووە

ئایا باسی وردەکاری دیمەنە سەرنج ڕاکێشەکان وتەکنەلۆژیای ناو بەهەشت چۆنە ؟ ئایا ئەوانەی کە پەروەردگار پێی ڕاگەیاندووین لە ڕێی پێغەمبەرانیەوە وە لە ڕێی کتابەکانیەوە چۆنە ؟

ئایا لەشی مرۆڤەکان چۆنە لەرووی ڕەنگ و باڵاو ڕوخسارەوە چۆن دەگۆردرێت ؟ ئایا هەندێک دەردراو هۆرمۆن لە فیزیۆلۆژی لەشی ئینسانەکاندا وەک (عارەقکردنەوە، بەڵغەم ، پاشماوەی خۆراک و خواردنەوە لە گیانیاندا ..هتد ) چی لێ بەسەردێت ؟

ئایا ئافرەتان بەتایبەت چیان پێشکەش دەکرێت ؟ ئەی پیاوان بەتایبەت چیان پێشکەش دەکرێت ؟ ئایا ئەوەی منداڵەکانی هەر بە بچوکی وەفاتیان کردووە لە بەهەشتدا چۆن بە دایک و باوکیان شاد ئەبنەوە ؟ ئایا ئەگەر ئافرەتێک پیاوەکەی لە دنیادا دۆزەخی بوو یان بەپێچەوانەوە ، چارەنوسی ئەو ئافرەتە یان ئەو پیاوە چۆن ئەبێ لەناو بەهەشتدا ؟

ئایا حۆری و خزمەتکار و کۆشک و تەلارەکان و باخ و باخاتەکانی ناو بەهەشت و ڕووبارو دەریاکانی ناوی چۆنن و لەچی پێکهاتوون ؟ ئایا هەر مرۆڤێکی بەهەشتی چەنێ زەوی و زار وکۆشک و تەلارو باڵەخانەو ڤێلای پێ ئەبەخشرێت واتە چەند هێندەی هەموو دونیایە بۆ هەر تاکێک ؟



ئایا باخیرەو کەشتیە ئاڵتونەکانی ناو دەریاو زەریاو رووبارەکانی بەهەشت چۆنە ؟

ئایا بازارکردن و کۆبوونەوەی ئەهلی بەهەشت لە رۆژی جومعاندا چۆنە ؟ ئایا چی لەگەڵ خۆیان ئەبەنەوە بۆ ناو ماڵ وکۆشکەکانیان لەو بازارەدا ؟ ئایا تازەبوونەوەی هەفتانەی هەموو بەهەشت چۆنە کە تیایدا ئەهلی بەهەشت توشی سەرسوڕمان ئەبن ؟

لەگەڵ چەندەها زانیاری تری سەرنج راکێشی ناو بەهەشت لەم کتێبەدا خوێنەری بن

لەگەڵ ئەم پارچە نوسینەدا گەشتێکی خێراو نموونەیی بەناو خۆشیە بێسنورەکانی بەهەشتدا بکە

بەهەشت ئەو جێگە پڕ کامەرانی و خۆشیەیە کە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ بەندە باوەڕدارەکانی بەجۆرێک کە ترسی تیانیە وە شوێنی ئارامیە وە ژیان تیایدا هەتاهەتاییە، پڕە لەباخ و باخاتی پڕ لەنیعمەت کە هاوشێوەی نیە لەسەر زەوی وە خۆشیەکەی بێ وێنەیە بەجۆرێک کە چەندەها ڕوباری جۆراو جۆر بەژێریاندا ئەڕوات وە خۆشترین و نمونەیی ترین شوێنی حەوانەوەن لەناو دروستکراوەکانی پەروەرگاردا

ئەو بەهەشتانە ئەمینترین جێگەن کە دروستکراون ، وە شوێنی کەسە ڕاستگۆو لەخواترس و موخڵیسەکانە بۆخوا ، فراوانی و پانتایی ئەو بەهەشتانە هێندەی گەورەیی ئاسمانەکان زەوییە کە بۆ کەسانی زۆر لەخواترس و ڕاستگۆ دابینکراوە .

هەر بەهەشتێک (( وەکو ئەستێرەیەک یان کەوکەبێک وایە لەناو بەهەشتی گەورەدا )) کە لە ئاڵتون و زیو دروستکراوە بەجۆرێکە کە کۆشک و تەلارەکانی خشتێکی ئاڵتوونە و خشتێکی زیوە و چەوولمەکەی هەمووی مرواری و زیوە نێوانەکەشی میسکە و خۆڵەکەشی زەعفەرانە بناغە و سەقفەکەی سەوز و سور و زەردە لە هەموو ڕەنگێکی تریشە بەجۆرێک کاتێک تیشک ئەدەنەوە وەکو بروسکە وایە قوبەکانیشی مرواری و گەوهەرە وە ژوورەکانی بەجۆرێکە لەدەرەوە ناوەوە دەبینرێت و لەناویشەوە دەرەوە دەبینرێت کە ژوورەکان لە مرواری سپی و یاقوتی سورو بەردێکی تەنکی سەوز دروستکراون کە نەشکاوە و نەدرزی تیایە وە ڕوبارو تاقگە و باخ و میوەی تیا نیشتەجێکراوە و لەگەڵ هاوسەرو خزمەتکار، لە باخ و بێستانەکانی ناو بەهەشتدا فیردەوس هەر بەرزەکەیانە کە باشترین و خۆشترین باخیانە، وەسیلە هەیە لەبەهەشت کە بەرزترین پلەی بەهەشتە و لەسەروی ئەوەوە پلەی لەو بەرزتر نیە وە ئەوە ئەو پلەیەیە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕجای لە پەروەردگار کردووە کە بۆ ئەو بێت وە داوای لە مسوڵمانان کردووە کە لەدوای هەموو بانگێک ڕەجای بەدەستهێنانی ئەو پلەیەی بۆبکەن لە پەروەردگار .

وە لەناو بەهەشتانێکدا چوار جۆر باخ هەیە کە دوانیان زیوە بەهەموو کەل و پەلەکانی ناویەوە وە دوانیشیان ئاڵتونە بەهەموو کەلوپەلەکانی ناویەوە ، هەر لەناو بەهەشتی گەورەدا بەهەشتانی عەدەن هەیە کە داپۆشراوە و سەری نراوەتەوە بە مرواریەک کە هیچ دروستکراوێک نازانێت چی تیایە وە هەموو ڕۆژێک لەلایەن

پەروەردگارەوە ڕازاوەترو جوانتر ئەبێتەوە بۆیە هیچ نەفسێک و ئیمانداریێک نازانێت کە چی بۆ شاردراوەتەوە لە بەختەوەری کە بەجۆرێکە نەچاو بینیویەتی نە گوێ بیستویەتی نەبە خەیاڵ و ختورەش بەدڵی کەسدا هاتووە .

بێینەوە سەر شوێنە بینراوەکانی بەهەشت لەلایەن نێردراوی خواوە لە شەوڕەوییەکەیدا علیە الصلاة و السلام کە ئەفەرمێت خاکی بەهەشت لەبۆنی میسکە کە خۆشترین بۆنی هەیە کە مەودای بۆنکردنەکەی ماوەی هەتا سەد ساڵ دەڕوات و بەپێی جیاوازی پلەی ئیمانداران ئەگۆڕێت .

بەهەشتەکان سەد پلەن کە فراوانی هەر دوو پلەیەکی هێندەی فراوانی و دووری نێوان زەوی و ئاسمانەکانە وە ئەم فراوانیەش لە لەگەورەیی دەرگاکانی و کۆشک و تەلار و درەختەکانیدا دەردەکەوێت بەبەروبومەکانیەوە بەجۆرێک کە لەنێوان ئەملاولای دەرگایەکی بەهەشتدا ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی چل ساڵە ، وە کەسی ئیماندار چادرگەیەکی هەیە کە لەمرواری ناوبۆش دروستکراوە بەرزی و پانتاییەکەی شەست میللە (( ١٠٠ کم )) .

درەختانی ناو بەهەشت بەجۆرێکە بۆنمونە درەختی (سدرة المنتهى) گەڵاکانی بەئەندازەی گوێی فیلێکە و بەروبومەکەی وەکو کوپەڵەی گەورە گەورە وایە ، هێشووە ترێیەکانی ناو بەهەشت هێندەی ئەندازەی ماوەی فڕینی یەک مانگی قەلەڕەشێکی پەڵاوییە کە لەمسەرەوە بفڕێت تا ئەوسەری بەبێ وەستان .

فراوانی دەرگاکانی بەهەشت وەکو ماوەی نێوان مەکەومەدینەو مەجەڕی بەحرەینە وە ماوەی نێوان دوو دەرگاش چل ساڵە وە هەندێکی تریان حەوت ساڵە وە دەرگاکان ناوی تایبەتی خۆیان هەیە .

لەبەردەم ئەم دەرگایانەدا چەند ڕووباری گەورە گەورە هەن وە لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی چوار ڕووبار دیاربووە هەر لەدوورەوە (( لەکاتی شەوڕەوییەکەیدا بۆ ئاسمانەکان و بەهەشت )) کە دوانیان لەناو بەهەشتدا بوون ( پێدەچێت کەوسەر و سەلسەبیل بێت ) و دوانی تریشیان لەدەرەوەی بەهەشت بوون کە ڕووباری فوڕات و نیلە وە سەرچاوەکەیان لەبەهەشتدایە خوای گەورە تەنها خۆی دەزانێت کە چۆن دەیهێنێت و لەسەر زەویدا هەڵیدەقوڵێنێت .

**تێبینی/** هاتنی ئەم دوو ڕوبارە (نیل وفوڕات) لەبەهەشتەوە بۆ سەر زەوی لەسیستەمی زەوی تەختدا زۆر لۆژیکیە چونکە ئاسمان بەگەورەیی بیناکراوە بەسەر زەوی فراوان وگەورەو تەخت وجێگیردا (( وبنینا فوقکم سبعا شدادا )).

کاتێک باوەڕداران پێش ئەوەی بچنەناو بەهەشتەوە لە ڕووبارێکیان (لە ڕوباری کەوثەرەوە بۆ حەوزی کەوثەر) دەخۆنەوەو هەرچی ئازارو ناڕەحەتی ناو سکیان هەیە نامێنێت پاشان دەچنە لای ڕوبارەکەی تریان و پێی پاک دەبنەوە وە گەش و جوان دەبنەوە بەجۆرێک کە دوای ئەوە قەت ڕووخسار و شێوەیان ناگۆڕێت وە قژیشیان بژو ئاڵۆزکاوی نابێت وەکو ڕۆنی لێدرابێت وایە .



پاشان دەگەنە لای دەرگاوانی بەهەشت و پێیان دەوترێت سڵاوی خواتان لێبێ بچنە ناوییەوە بۆ هەتاهەتایی .

وە یەکەم خواردنێک کە پێشکەش دەکرێت بە یەکەم تاقمی اهلی بەهەشت جگەری حوت و گایە کە حەفتا هەزار کەس لێی دەخوات .

ئەو کەســەی کە نزمترین پلەی بەهەشــتی هــەیە ئەتوانێت میوانداری هەموو خەڵکانی دونیا بکات بەبێ ئەوەی لەبەشی خۆی کەم بکات .

نزمترین کەسی بەهەشت موڵکەکەی ١٠ هێندەی موڵکی هەموو دونیایە وە پانتاییەکەی هێندەی ماوەی سەد ساڵە کە بەچاوی خۆی ئەیبینێت .

ئەهلی بەهەشت کەسانی خاوەن کۆشک و تەلارەکانی سەروو خۆیانەوە لەشێوەی ئەستێرەیەکی پرشنگدار ئەبینن کە وەکو ئەستێرەیەکی پرشنگداری ڕۆیشتووە لەئاسۆی ڕۆژهەڵات یاخود ڕۆژئاوای بەرزی ئاسماندا بەهۆی جیاوازی پلەکانیان .

وە ئەو شوێنانە جێی کەسانێکە کە باوەڕیان بەخوای خۆیان هەبووە و پێغەمبەرانیان بەڕاست زانیوە .

خوای گەورە بەنسیبمانی بکەیت

## ناساندنی ناوی بەهەشت و
## شوێنی درەختی ( سدرة المنتهى )



بەهەشت : ناوێکی تایبەتە بۆ ئەو جێگە پڕ کامەرانی و خۆشیەیە کە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ پیاوچاکانی خۆی، وە بنچینەی وشەکە ( الجنە ) وەرگیراوە لە واتای داپۆشراو شاراوە، هەروەکو ( جنین ) کە شاراوەیە لە سکی دایک دا، هەروەها وشەی (جن) کە لەچاو شاراوەیە وە ( مجنون ) (واتە شێت) کە عەقڵی داپۆشراوە وە ( بستان) ( واتە باخ ) دەوترێت (جنة) واتە بەهەشت چونکە هەموو لایەکی لەناوەوە داپۆشراوە بە دارو درەخت

**بەهەشت و ناوەکانی/** جێگەی بێ ترس و ئارامی، بەهەشتی نەبڕاوەو هەتا هەتایی، جێگەو باخاتی پڕ نیعمەت، باخە تایبەتیەکانی جێگەی عدن، باخەکانی جێگەی فیردەوس، جێگەو باخەکانی حەوانەوە، ماڵ و نیشتمانی خۆپارێزەکان، نیشتمانی نیشتەجێ و ئارامی، جێگەی مانەوەی بێ ترس ، نشینگەی ڕاستی و ڕاستگۆیان .

پەروەردگار بەهەشتی لەگەڵ دروستکردنی زەوی و ئاسمانەکاندا دروست کرد پێش دروستکردنی ئادەم علیە سلام ئامادەکراوە بۆ جێبەجێکارانی فەرمانەکانی خوا جل جلالە، پاش دروستکردنی بەهەشت و دۆزەخ پەروەردگار جبریلی نارد علیە سلام بۆ تەماشاکردنی ناو بەهەشت و پێی فەرموو : بڕۆ سەیری بکە و تەماشا بکە چیم ئامادەکردووە بۆ خاوەنەکانی .... ))



سدرة المنتهى / بریتیە لە دار سیدری گەورەو مەزن دەکەوێتە ناو بەهەشتەوە (ئاسمانی حەوتەم) وە رەگەکانی لە ئاسمانی شەشەمدایە ~ گەورەیی و جوانی و پێشکەوتوویی ئەو درەختە وەسف ناکرێت لەوێوە چوار رووبارە گەورەکەی ناو بەهەشت هەڵدەقوڵێت و (نیل و فورات دوانیانن) گەڵاکانی بەئەندازەی گوێی فیلە و بەروبوومی ئەو درەختە وەک کوپەڵەی گەورە گەورە وایە ~ هەر لەوێوە نیشتمانەکانی بەهەشتی حەوانەوەکان دەست پێدەکات.

پێغەمبەری خوا لە شەو ڕەوییەکەیدا بەرزکرایەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم پاشان بۆ ( سدرة المنتهى ) پاشان بۆ بەهەشت .... خۆی دەفەرمووێت ( ... بەرەو ئاسمانی حەوتەم کەوتینە ڕێ و جبرەئیل داوای کردنەوەی دەرگاکەی کرد ... پاشان بەڕێکەوتین بۆ سدرة المنتهى )))

پێغەمبەری خوا علیه صلاة والسلام فەرموویەتی: ( لەگەڵ جبریل بەڕێکەوتین تا گەیشتینە جێگەی (سدرة المنتهى) کۆمەڵە ڕەنگێک دایپۆشی بوو نەم دەزانی چیە ؟ ئەنجا چوومە ناو بەهەشتەوە تەماشام کرد قوبەو گومەزی مرواری لێیە ، وە خاکەکەی بۆنی خۆشی میسک بوو)

پێغەمبەری خوا علیه صلاة والسلام فەرموویەتی: (ڕۆحی بڕوادار وەکو باڵندەیەک وایە بە درەختەکانی بەهەشتەوە چلاو چڵ دەکات و دەنۆشێت تاکو ئەو ڕۆژەی دەگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا ))

بەهەشت لە سەرو ئاسمانی حەوتەمەوەیە لەژێر عەرش دا لای ( سیدرة المنتهی ) لەوێدا بەهەشتی مأوی هەیە کە جێگەی حەوانەوەیە ، هەروەها بەهەشتی زۆر بەرزی سەرو ئاسمانەکان

## بیرخستنەوەیەك و پاشان بەڕیزبەندی لە حەوزی کەوثەرەوە بۆ ناو مەملەکەتەکانی بەهەشت



خەڵکان هەر لە دونیادا زۆر ماندووبوون بە چەند قۆناغێکی سەخت و دژواردا تێپەڕین هەر لە ڕۆژی لەدایک بوونیانەوە و بەناو سێ قۆناغی منالّی و گەنجی و پیری و سەختیەکانی ژیان و نەخۆشی و نەهامەتی و نەبوونی و کێشەو مەشاکیلەکانی ژیانی دونیاو بژێوی و خوێندن و هەوڵدان بۆی و تیایدا گوزەران ...هتد

دواتر خەڵکان نەقڵ بوون و گوێزرانەوە لە دونیاوە بۆ جیهانی بەرزەخ و نارەحەتیەکانی ناو ئەو جیهانە .

دواتر خەڵکان لەیەکەم ڕۆژی قیامەت زیندوو کرانەوەو ڕۆح گەڕێندرایەوە بۆ ناو لاشەکانیان و هەستانەوە لە گۆڕەپانی مەحشەردا و سەختی و نارەحەتیەکانی ئەو ڕۆژەو ڕاوەستانی زۆرو هەروەها سزاو نارەحەتی زۆری ئەو ساحەیە و برسێتی و تینوێتی و گەرمای ئەو ڕۆژەو هەروەها لێپێچینەوەو لێپرسینەوەو پێدانی نامەی کردەوەکان و ڕۆیشتن بۆ ناوچەو جێگە تاریکیە سەختەکان وە پاشان بۆ سەر پردی سیراط وە تێپەڕبوون بەسەر ئەو پردە سەخت و نارەحەتەدا ...هتد

بیهێنە پێش چاوی خۆت تۆ لە سێ جیهاندا (دونیا ، بەرزەخ، قیامەت) ڕووبەڕووی هەموو ئەم ڕووداوانە بوویتەتەوە، لەکۆتایی هەموو ئەم قۆناغانەدا خوا ڕەحمی پێکردیت و ڕزگارت بوو لە

دۆزەخ، ئیتر کاتی ئەوەیە بەیەکجاری کۆتایی بە ناڕەحەتی بێت و ژیانی ڕاستەقینەو هەتا هەتایی دەست پێ بکات ، ئیتر کاتی ئەوەیە بەس لە خۆشیدا بژیت، چونکە تۆ تامی هەموو ناڕەحەتی و سەختیەکانی جیهانەکانی (دونیاو بەرزەخ و قیامەتت) کرد لە پێناوی تەنها خواپەرستی و دینی خوای گەورەدا ، بۆیە مادام تۆ مسوڵمانیت و موەحیدیت خوای گەورەت بەتەنها پەرستووەو هیچ شەریک وهاوتایەکت بۆ بڕیارنەداوەو لەگەڵ پەروەررگاردا داوات لەکەسی تر نەکردووەو لەغەیری بەرنامەو دینەکەی ئەو شوێن هیچ ڕێچکەو بەرنامەو فکرو دینێکی ترو بەرنامەی دەستکردی مرۆڤەکان نەکەوتوویت تەنها لەسەر ڕاستە ڕێیەکەی ئیسلام بوویت لەکۆتاییدا پەروەرێن مژدەی ژیانە هەتا هەتاییەکەی ناو بەهەشتت پێ دەدات و پێت دەبەخشێ و دەچیتە ناو بەهەشتانێکەوە کە هێندەی نیعمەت تیایە نە چاوەکان بینیویانە نە گوێیەکان بیستوویانە نە دڵەکانیش ئەتوانن وێنای بکەن هێندە خۆشن ئەو بەهەشتانە شوێنی ئارامی و ئاسودەیی هەتا هەتایین

## گەشتی خەڵکان لەدوای پردەکان بۆ ناو مەملەکەتەکان



ئیتر لێرەوە بۆتان باس ئەکەم چۆن خەڵکان بەڕێ ئەکەون بەرەو ئەو بەهەشتە خۆشە لەدوای پردی سیڕات و پردی قەنتەڕەوە خەڵکان لەسەر پردی قەنتەڕە بەکردەوە چاکەکانیان تۆڵەیان بۆ لەیەکتر دەسێندرێتەوە بەجۆرێک هەرچی ڕق و کینەو حەسودی و زبری هەیە لە دڵەکانیاندا دەردەکرێت و ئیتر لەوێدا مرۆڤێک نابینی هێندەی گەردێک ڕقێک یان کینەیەک لە دڵیدا بمێنێ بەرامبەر برایەکی یان خوشکێکی مسوڵمانی دڵیان پاک پاک دەکرێتەوە بەتەواوەتی ، چونکە ئەوانەی دەچنە بەهەشتەوە دەبێ پاک بن و هیچ خەوش و گەردێک نەمێنێ لە ناخ و دڵ و دەروونیاندا

پێش گەیشتن بەبەهەشت چەند حەوزێک هەیە کە هەریەکەیان تایبەتە بە پێغەمبەرێک واتە هەموو پێغەمبەران حەوزی تایبەت بەخۆیان هەیەو بانگی شوێنکەوتووانی خۆیان دەکەن تا بێن لێی بخۆنەوەو کۆتایی بەتینویەتی و برسێتیەکەیان بێت بۆ هەتا هەتایە کە بەهۆی نارەحەتی گۆڕەپانی مەحشەرەوە توشیان بووە

لەو ڕۆژەدا و لەو ساتەدا خوای گەورە ڕێز دەبەخشێت بە پێغەمبەران علیهم السلام بەوەی کە بە هەموو پێغەمبەرێک حەوزێک دەبەخشێت لەبەردەم بەهەشتدا تاکو ئومەتی ئەو پێغەمبەرە لێی بخواتەوە و بەتایبەت لەنێوانیاندا پێغەمبەری خۆمان علیه الصلاة

والسلام کە خوای گەورە ڕێزی لەوان زیاتر پێ دەبەخشێت بەوەی حەوزی کەوثەری تایبەتی پێ دەبەخشێت

حەوزی کەوثەر لەدوای پردی سیڕاتەوەیەو لەپێش چوونە ناو بەهەشتە یاخود لە تەنیشت بەهەشتدایەو لە ڕووباری کەوثەری بەهەشتەوە ئاوەکەی دەڕژێتە ناو حەوزەکە

ئەم حەوزە زۆر گەورەیە و جێگەیەکی زۆر بەڕێزەو لە ڕووباری کەوثەری بەهەشتەوە ئاوی بۆ دێتە ناوی و حەوزێکی زۆر فراوانەو درێژی و پانیەکەی وەک یەکە ، ئەوەش خەڵاتێکی هەرە گەورەو بەڕێزە کە بەخشیویەتی بە پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام

پێغەمبەری خوا باسی درێژی و پانی (ڕووبەری) حەوزەکەی کردووە بۆ چەند خەڵکانێکی جیاواز لەچەند شارو وڵات وشوێنێکی جیاواز بەگوێرەی ئەو شوێنانەی لێی ژیاون تا بەئاسانی خەڵکە جیاوازەکان لێی تێبگەن بەم شێوەیە :-

درێژی و پانی ئەم حەوزە هێندەی نێوان (ئیلا و سەنعایە، مەدینەو سەنعایە ، مەدینەو عەممانە ، ئیلاو مەککەیە ، عەدەن بۆ عەممانە ، کەعبە بۆ قودسە ، جەربائو ئەزرەحە)

واتە ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە ، ماوەی نێوان سەنعا بۆ مەدینە ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە بۆ کەسێک پەلەی نەبێت و لە ئیلەوە بۆ مەککەش بەهەمان شێوە ، هەروەها لە مەدینەوە بۆ عەممانی شامیش .

پێغەمبەری خوا لەباسی وەسفی حەوزەکەیدا لەڕووی ڕووبەرەوە بۆ هەر کۆمەڵێک بەگوێرەی زانینی قسەکەرەکە بووە و بەشێوەیەک وەڵامی داوەتەوە کە پرسیارکاری پێ تێ بگەیەنرێت

بەکورتی ماوەی حەوزی کەوثەر دیاریدەکرێت بەوەی درێژی و پانیەکەی ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی مانگێکە هەموو لایەکانیشی وەک یەک وان و گۆشەکانی یەکسانن و درێژی و پانیەکەی وەک یەکە

ئاوی حەوزی کەوثەر ( ئاوێکە سپی ترە لە شیر (یاخود بەفر) و ساردترە لە سەهۆڵ و شیرینترە لە هەنگوین و نەرمترە لە پەنیر (کەرە) و بۆنخۆشترە لە میسک ، هەر کەسێک قومێکی لێ بخواتەوە دوای ئەوە هەرگیز تینووی نابێت و هەرگیز ڕووی ڕەش نابێت لە قەراغەکانی ئەم حەوزەدا زیاتر لە ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان سوراحی و جام و کوپ و پەرداخی ئاڵتوون و زیو دەبینرێت ئاوی ئەم حەوزە وەرگیراوە لە ڕووبارێکی ناو بەهەشت کە بەهەمان شێوە ئەو ڕووبارەش ناوی کەوثەرە و خوای پەروەردگار بەخشیویەتی بەپێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام ، ئەو ڕووبارەیە کە لە میعراجدا چاوی پێ کەوت، ڕووباری کەوثەر ڕووبارێکە لەبەهەشتدا دەڕوات بەسەر ڕووی زەوییەکەیدا بەبێ ئەوەی پێویستی بەچاڵ وجۆگە بێت و جێگە ڕۆیشتنەکەی هیچ درزیەکی تیانیە و لێوارەکانی ئاڵتوونە و هەروەها قوبەی دوڕی ناو بۆشە یاخود قوبەی مرواری ناوبۆشە، واتە ڕۆیشتنی ڕوبارەکەی بەسەر مرواری و دوڕو یاقوتدایە، چەو و زیخەکانی هەمووی مرواریە و بۆنی خاکەکەی خۆشترە لە میسک (لە میسکی ئیذفەڕ...)

ئاوەکەی سپی ترە لە شیر (یاخود بەفر) و ساردترە لە سەهۆڵ و شیرینترە لە هەنگوین و نەرمترە لە پەنیر (کەرە) و بۆنخۆشترە لە میسک ، چەند باڵندەیەکی تێدایە ملیان وەک ملی حوشتر وایە (ئیمامی عومەر فەرمووی بەڕاستی ئەوانە زۆر لە خۆشیدان (واتە باڵندەکان ) ، پێغەمبەری خواش علیه الصلاة والسلام فەرمووی ( بخۆرەکەی چاکترەو نیعمەت پێدراوترە زیاتر لە خۆشیدایە ) .

ئاوی ڕووباری کەوثەر دەڕژێتە ناو دوو پلوسکەوە (دوو شیوەوە) یەکیان ئاڵتوونەو ئەوی تریان زیوە کە دوڕی بەسەردا کراوە و هەردووکیان دەڕژێنە ناو حەوزی کەوثەرەوە

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەران شانازی بەوەوە دەکەن کە کێیان زیاتر ژمارەی هاتووانی سەر حەوزەکەی زیاتر بێت و پێغەمبەری خۆشمان دەفەرموویێت من هیوام وایە کە هاتوانی سەر حەوزەکەم لەهەموویان زیاتر بێت

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەران هەموو یەکێک لەوان گۆچانێکی بەدەستەوەیەو ئەوەی بیناسێت لە ئومەتەکەی بانگی دەکات بۆلای حەوزەکەی

لەو ڕۆژەدا پیاوان و ئافرەتانی ئومەتەکانی تر دێنە لای حەوزی کەوثەر و گۆزەو قاپیان پێیە و دەیانەوێت ئاوی حەوزەکەی تێبکەن و ماوەیان نادرێت کە لێی بەرن و بیخۆنەوە

لەو ڕۆژەدا پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام گۆچانێکی بەدەستەوە دەبێت بۆ دوورخستنەوەی ئەو کەسانەی لە ئومەتەکەی

خۆی نین وەک دوورخستنەوەی وشترێکی نامۆ خۆی دەفەرمووێت ( ... من لای حەوزەکەمدام ، خەڵکانی تری لێ دووردەخەمەوە و بەدارەکەم لێیان دەدەم (واتە لە کوپ وسورحیەکانیان دەدات) تا ئاوەکە تەواو لێی بڕژێت بۆ ئومەتتەکەم ).

جارێ لەبەردەم حەوزەکانی بەردەم بەهەشتداین ، پێویستە بزانن کە لە کتێبی ( قیامەت ڕووداوەکان و گۆڕانکاریەکان ) ڕوونمان کردۆتەوە کە زۆرێک لەو حەوزە دوور دەخرێنەوە و هۆکارەکانیشمان باسکردووە

## ئایا خەڵکان چ گۆڕانێك بەسەر لاشە و ڕوخسار و باڵا و پێکهاتەکانی لەشیاندا دێت؟



**دوو گۆڕانکاری هەیە :**

**یەکەم/** گـــۆڕانی یەکەمی لاشـــەی مرۆڤـــەکان لە ســـەرەتای زیندبوونەوەیان و هەڵسانەوەیان لە گۆڕەکانیان لە گۆڕەپانی مەحشەردا کە ئەویش بریتیە لە:

**١/** هەموو مرۆڤەکان کە زیندوو دەکرێنەوە بۆ حساب و لێپرسینەوە لە ساحەی مەحشەردا هەموو ڕووت و قوت و پێ پەتین و کۆدەکرێنەوەو تەمەنیان لە تافی لاوێتیدایە واتە ٣٣ ساڵن ئیتر ئەگەر ئەو کەسە لەبارچوو بووبێت یاخود بەپیری مردبێت ئەوا خوای گەورە لە تەمەنی ٣٣ ساڵیدا زیندووی دەکاتەوە ، وە ئەو مرۆڤانە لە ساحەی مەحشەردا بەباوەڕدار و بێ باوەڕیانەوە شکڵ و شێوەیان دەگۆڕدرێت و جیاواز دەکرێت ، واتە بێدینەکان بەپێی کوفرو بێ دینی و تاوانباریان لەساحەی مەحشەردا قەبارەو باڵاو ڕەنگ و شێوەیان جیاواز دەکرێت بەجۆرێک بێدینە لوتبەرزەکان و دووڕووەکان قەبارەیان بچوک دەکرێنەوە وەک مێرووە بچوکە ڕەشەکانیان لێدێ و ئەکەونە ژێرپێی خەڵکانەوە ...هتد ... وە زۆر گۆڕانی تر بەنمونە مسوڵمانە زۆر تاوانبارەکانیش شێوەیان بەپێی جۆری تاوانە گەورەکانیان دەگۆڕدرێت ...کە لە کتێبی قیامەت بەوردەکاری باسم کردووە

٢/ لە گۆڕەپانی مەحشەردا باوەڕدارەکان بەپێی پلەی ئیمان و پلە بەرزیان پۆشتە دەکرێن لەنمونەی ئەوانەی کە لە ساحەی مەحشەردا پۆشتەدەکرێن بریتیە لە خۆشەویستی خوا پێغەمبەر ئیبراهیم علیه سلام ، خوای گەورە پۆشاکێکی سپی قیبطي بەر بەردا دەکات ، هەروەها پەروەردگار پۆشاکێکی سەوز یاخود سور بەبەر پێغەمبەر محمد دا دەکات علیه الصلاة والسلام ، هەروەها پاش ئەو دوو پێغەمبەرە هەندێ لە بڕواداران پۆشتە دەکرێن لە ساحەی مەحشەردا بەگوێرەی پلەی بەرزی ئیمانیان و هەندێ کردەوەی گەورەو تایبەتەوە کە ئەنجامیان داوە ( لەکتێبی قیامەتدا بەوردەکاری جۆری کردەوەکان باسکراوە )

ئەمە لە ساحەی مەحشەردا بوو ئەم گۆڕینەی یەکەم

گۆڕینێکی تری لاشەی مرۆڤە بێ دین و بێ باوەڕەکان هەیە

بەتایبەتی لەناو دۆزەخدا کە لاشەیان هێندەی شاخەکان گەورە دەکرێن بۆئەوەی سزاکانیان توندترو بەهێزترن بن ( لەباسەکانی بەندینخانەکانی دۆزەخدا بەوردەکاری باسیان لێکراوە)

دووەم / گۆڕانی فیزیۆلۆجی لاشەی باوەڕداران و ئامادەکردنیان بۆ ناو نازو نیعمەتە گەورەکانی بەهەشت

١/ تەمەنی گشت باوەڕداران ٣٣ ساڵە کە دەچنە بەهەشتەوە لەو تەمەنە گەورەتر نابن بچوکیش نابن ، پرسیار بۆچی ئەبێ ٣٣ ساڵ بن ؟

وەڵام/ چونکە لەم تەمەنەدا مرۆڤەکان لەلوتکەی گەنجیدان و جەستە بەتەواوی پێگەیشتووەو وە لەدونیادا مرۆڤ ئەندامەکانی

لاشەی لەمنداڵیەوە گەشەدەکات تا تەمەنی ٣٣ ساڵی پاشان لە گەشەکردن دەوەستێت وە لەدوای تەمەنی ٣٣ ساڵی وردە وردە بەرەو پوکانەوەو بچوکبوونەوەو پیربوون دەڕوات

٢/ هەرکەسێک دەچێتە ناو بەهەشت لەسەر شێوەی ئادەمە علیە سلام بەرزیەکەی ٦٠ باڵە (واتە ٣٠ مەتر بەنزیکەیی) و پانیەکەشیان ٧ باڵە ( واتە بەنزیکەیی سێ ٣ مەترو نیوە )

٣/ پەروەردگار شێوەی مسوڵمانان ئەکاتە باشترین وێنە کە هەموو ڕەنگ سپین و چاو ڕێژراون ، ئەهلی بێ توک و موون هەموو گەنجی تەمەن ٣٣ ساڵانن ، لاشەی پتەو بەهێزیان هەیە

٤/ ئەهلی بەهەشت خوای گەورە ڕق و کینەو ڕەوشتی خراپ و دوژمنایەتی لەدڵیان دەردەکێشێت پاشان دەیانخاتە ناو بەهەشتەوە واتە ئەهلی بەهەشت کە دەچنە ناو بەهەشتەوە بەشێوەی ئادەمە لە باڵا بەرزیدا وە بەشێوەی یوسفە لە جوانیدا وە لەسەر شێوەی پاکێتی دڵی ئەیوبە سەلامی خوایان لێبێت، پێغەمبەر یوسف علیە سلام نیوەی جوانی پێ بەخشراوە بەخۆی و بەدایکی لەدونیادا

بەگەیشتنی باوەڕداران بۆناو بەهەشت دەست دەکەن بە خواردنەوەی ئاوی ئەو ڕووبارەی کە لای دەرگای بەهەشتەوەیە، هەرچی ئازارو پیسی هەیە بەهۆی ئەو ئاوەوە دەڕوات وە خۆشی و نیعمەتەکان بەسەریاندا دەڕژێت وە قژیان نائاڵۆزکێت و بژ نابێت ... هیچ جیاوازیەک و ڕق و کینەیەک لەنێوانیاندا نیە و دڵەکانیان لەسەر دڵی یەک پیاوە ...



باوەڕداران ڕوخساریان لەسەر شێوەی درەوشاوەترین ئەستێرەی ئاسمانە کە دەکرێنە ناو بەهەشتەوە واتە کاتێک دەگەنە بەر دەرگای بەهەشت لە دوو سەرچاوە و ڕووباری بەردەوام لێ ڕۆیشتوو دەخۆنەوە وە چی ناڕەحەتی و ناخۆشی لەناو سکیاندا هەیە دەڕوات و پاک دەبنەوە پاشان نیعمەتەکانیان پێ دەبەخشرێت

باوەڕداران کە دەکرێنە بەهەشتەوە بەڵغەم و میزو پیساییان نیە هەرچی شتێکی نەجس و پیس هەیە دەردەکرێت لەلەشیاندا کۆتایی پێدەهێنرێت

لێرەدا تەنها ئاماژەم بەوەدا چ گۆڕانێکی فیزیۆلۆجی بەسەر ئەندامەکانی لەشی مرۆڤە بەهەشتیەکاندا دێت پێش ئەوەی بکرێنە ناو بەهەشتەوە چونکە نابێت بەو لاشە شەکەت و ماندوو کاتیەوە بکرێنە ناو جیهانێکەوە کە پڕە لە نیعمەتی نەبینراو و نەبیستراو بەخەیاڵدا نەهاتوو بەڵکو ئەبێ لاشەکانیان گۆڕانێکی وای بەسەردا بێت کە بۆ هەتا هەتاییە بتوانن لەناو ئەو مەملەکەتە گەورانەی ناو بەهەشتەکاندا بژین



## دەبێت لەبەردەم دەرگاکانی بەهەشتدا چی هەبێت؟

پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت ( واتە کاتێک لە ئیسراو میعراجدا بوو ) هەر لە دوورەوە چوار ڕووبار دیاربوو دوو ڕووبار لەناو بەهەشت وە دووانی تر لەدەرەوەی بەهەشت ئەو دووانەی ناو بەهەشت ( پێ دەچێت کەوسەرو سەلسەبیل بێت (والله اعلم) . وە ئەو دووانەی دەرەوەی بەهەشت فوڕات و نیلە ( سەرچاوەکەی کە لەبەردەم بەهەشتدایە خوای گەورە خۆی دەزانێت کە چۆن دەیهێنێت و لەسەر زەویدا هەڵی دەقوڵێنێت ) دەفەرمووێ بە جبریلم وت ئەوانە چین ؟ فەرمووی ئەوانە دوو ڕووباریان لەبەهەشت دایە و وەئەوانەی کە لەدەرەوەی بەهەشتن (( نیل و فوڕاتن )) وە ئەم دوو ڕووبارە پێش ئەوەی باوەڕداران بچنە ناو بەهەشتەوە لێی دەخۆنەوە واتە ئەو خەڵکانەی کە تەقوای خوایان کردووە (مەبەست ئەهلی بەهەشتە) بەڕێدەکرێن بەرەو بەهەشت تاکو دەگەنە بەردەم دەرگای بەهەشت لەوێدا درەختێکی گەورە دەبینن کە دوو ڕووبار لەژێریدا دەڕوات دەچن بۆلای ڕووبارێکیان وەکو فەرمانیان پێکرابێت وە لێی دەخۆنەوە چی لەناو سکیاندا هەبووە لە ئازارو نارەحەتی تیایدا نامێنێت ، پاشان دەچن بۆ ڕووبارەکەی تریان وە پێی پاک دەبنەوە ، وە گەش و جوان دەبنەوە ڕویان لەدوای ئەوەوە هەرگیز گۆڕانکاری بەسەردا نایەت ، وە قژیشیان بژو ئاڵۆسکاو نابێت وەکو ڕۆنی لێ درابێت وایە ....



**تێبینی/** لە سیستەمی زەوی تەختدا کە ئاسمان بیناکراوە وەک سەقفێک بەسەر زەوی جێگیری فراوان و گەورەی تەخـــت زۆر لۆژیکیـــە کە هەردوو ڕووبـــاری نیـــل و فوڕات لە بەردەم بەهەشتی گەورەی ســـەرو ئاسمـــانی حەوتـــەم ڕێڕەوی خـــۆیان بگـــرن و پـــەروەردگـــار بیـــانهێنێت و لەناو خـــانە بچوکەکەی ئێمەی مـــرۆڤ (واتە حەوت قاڕەکەو دەریاو زەریـــاکان کە لەخانەیەکی بچـــوکی نـــاو زەوی تەختی گەورەدان)



ئەم وێنەیە تەنها بۆ تێگەیشتنە




ئەم نەخشەیە تەنها بۆ تێگەیشتنە

پاشان ڕووباری فوڕات لە کوردستانی باکورو ڕووباری نیل لە وڵاتی ئۆگەندا هەڵبقوڵێنێت و یەکیان لەعێراقەوە بڕژێتە کەنداوی عەرەبیەوەو ئەوی تریشیان لە وڵاتی میسرەوە بڕژێتە دەریای ناوەڕاستەوە

(هەر لەدونیاشدا)

پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت (شەهیدەکان ئەوانەی تەنها لە پێناوی سەرخستنی دینی خوادا شەهیدبوون) ڕۆحیان دەچێتە ناو گومەزێکی سەوز لای ڕۆخی ڕووبارێکی بەردەم بەهەشت هەموو بەیانیان و ئێوارانێک لەبەهەشتەوە ڕزقیان بۆ دێت

بــاوەڕداران و پێغــەمبەران ئێســتا هەموو لەبەردەم دەرگاو دیوارەکانی بەهەشتدان

ئایا ئەبێت دیوارەکان چی بن ؟ ئەبێ لە چی دروستکرابن ؟ ئەی دەرگاکانی بەهەشت ئەبێ چۆن بن و لە چی دروستکرابن ؟



## دیوارە گەورەکانی بەهەشت چۆنن لە چی دروستکراون ؟



خوای گەورە دیواری بەهەشتی لە ئاڵتوون و زیو دروست کردووە بەجۆرێک خشتێکی لە ئاڵتوون و خشتێکی لە زیو دروستکردووە ، چەو و لمەکەی هەمووی مرواریە و تێکەڵی نێوانەکەی میسکە وە خۆڵەکەشی زەعفەرانە

## گەورەیی و فراوانی دەرگاکانی بەهەشت بەئەندازەی دەیان ساڵە



دەرگاکانی بەهەشت هەشت دەرگایە واتە بەهەشت ٨ دەرگای هەیە وە دۆزەخیش ٧ دەرگای هەیە

کەسانێک هەن هێندە پلەیان گەورەیە کاتێک لەبەردەم بەهەشتدان هەر هەشت دەرگاکەیان بۆ دەکرێتەوە بۆئەوەی لەکامیانەوە ویستیان لێبوو لەوێوە بڕۆنە ناو بەهەشتەوە

فراوانی نێوان دەرگاکانی بەهەشت

هەندێک دەرگا ماوەی (فراوانی) نێوانیان وەکو مەککەو مەدینە و هەجەری بەحرەینە ... وەک مەککەو بوسڕایە ...

هەندێک لە دەرگاکان ماوەی نێوانیان (فراوانی) چل ٤٠ ساڵە ...

ماوەی نێوان (فراوانی) دوولای دەرگایەکی بەهەشت ٤٠ ساڵ ڕێگەیە .

هەندێک دەرگای تر ماوەی (فراوانی) نێوان دوو لایان ٧ ساڵە

لەم جیاوازیانەوە بۆمان دەرەکەوێت کە دەرگاکانی بەهەشت جیاوازن لەڕووی گەورەیی و فراوانی و پانیەوە هەیانە ماوەی چل ساڵە و هەندێکیان حەوت ساڵە و وە هەندێکیان ماوەی نێوانیان وەک ماوەی نێوان مەککەو هەجەرە

هەموو دەرگاکانی بەهەشت ناوی تایبەت بەخۆیان هەیە بەپێی جیاوازی کردەوە چاکەکانی باوەڕدارانەوەیە وەک دەرگای خێرکردن و دەرگای ڕەیان و جیهاد و نوێژ...هتد

لەبەردەم بەهەشتدا کەسانێک هەن لەدەرگای جیهادەوە بانگیان لێدەکرێت و پێشوازیان لێدەکرێت بۆ چوونە ناوی چونکە ئەمانە جیهادیان کردووە لە پێناوی بەرزڕاگرتنی دینی خوای گەورەدا هەروەک پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت شمشێرەکان (چەکەکان) کلیلەکانی بەهەشتن

لەبەردەم بەهەشتدا کەسانێک هەن لە دەرگای نوێژەوە بانگیان لێدەکرێت و پێشوازیان لێدەکرێت بۆ چوونە ناو بەهەشتەوە چونکە ئەمانە خاوەنی نوێژن بە فەرزو زۆری شەونوێژو نوێژە ڕەواتبەکان و نوێژە سونەتەکانەوە کە ئەنجامیان داوە



ڕۆژووانەکان دەرگایەکیان هەیە لەبەهەشتدا ناوی (الريان) (واتە : تونی شکێن) جگە لەوان هیچ کەسێکی تر لەو دەرگایەوە ناچێتە بەهەشتەوە و گەر ئەوان هەموو چوونە بەهەشت ئەو دەرگایە دادەخرێت و ئەوان ئیتر هەرگیز تینویان نابێت

کەسانێک هەن لە دەرگایەکەوە بانگیان لێدەکرێت بۆ چوونە ناو بەهەشت کە ناوی دەرگای زیکرە ئەویش زیکری (لاحول ولا قوة الا بالله ) یە

یەکێکی تر لە دەرگاکانی بەهەشت ناسراوە بە دەرگای چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوکدا

یەکێکی تر لەدەرگاکانی بەهەشت کە ئەکەوێتە ناوەڕاستی دەرگاکانی بەهەشتەوە بریتیە لە دەرگای (باوک) ئەو کەسانە لێوەی دەچنە بەهەشتەوە کە پارێزگاریان لە دایک و باوکیان کردووەو (زۆر ڕێزیان لێگرتوون و ئاگاداریان بوون)

یەکێک لەدەرگاکانی بەهەشت ناوی دەرگای تەوبەیە کە ئەم دەرگایە هەمیشە کراوەیەو داناخرێت چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێ بەهەشت چەند دەرگایەکی هەیە هەموو دادەخرێن و دەکرێنەوە تەنها دەرگای تەوبە داناخرێت

پێدەچێ دەرگاش هەبێت بۆ حەج و عومرەو سوپاسگوزاری ...

**تێبینی** / لە ڕۆژی قیامەتدا مرۆڤەکان بە زۆرینەی کردەوەکانیان بانگ دەکرێن ئەگەر نوێژەکانیان باشتر بوو ئەوا بەو ناوەوە بانگیان لێدەکرێت وە ئەگەر ڕۆژووەکانیان باشتر بێت ئەوا بەو

ناوەوە بانگیان لیَ دەکریێت وە ئەگەر خاوەنی جیهادبوون ئەوا بەناوی جیهادەوە

**تێبینی** / لەویێش لەبەردەم بەهەشتدا نیزام و سیستەم هەیەو کاروبارەکان هەڕەمەکی نین بەڵکو لەویَ بە نیزام سیستەم و ناو خویێندنەوە بەپیێی کردەوەو پلەکان و جۆری دەرگاکان خەڵکان ئەتوانن بچنە ناو بەهەشتەوە

ئەبوبەکر (رضي الله عنه) فەرمووی ئەی پیێغەمبەری خوا کەس هەیە لە دوو دەرگاوە بانگی لیێوە بکریێت ؟ فەرمووی : بەڵیَ : ئەوە تۆ دەبیت .

**تێبینی** / هیێشتا خەڵکان نەچوونەتە ناو بەهەشتەوە بەڵکو من تا ئیێرە تەنها باسی چۆنیێتی دەرگاو دیوارەکانی بەهەشتم کردووە



## بۆنی ناوازە و خۆشی ناو نیشتمانەکانی بەهەشت



بۆنی خۆشی بەهەشت بەپێی ماوەکان جیاوازیان هەیە ئەوەش بەهۆی بەرزونزمی پلەی باوەڕدارانەوەیە لە ڕۆژی کۆتاییدا (والله اعلم) کە بۆ هەندێک ماوەی بۆنکردنەکەی لە دووری چل ساڵەوە هەست پێدەکات ، بۆ هەندێکی تر لە دووری حەفتا ٧٠ ساڵەوە هەست پێدەکات ، بۆ هەندێکی تر لە دووری سەد ١٠٠ ساڵەوە بۆنی خۆشی بەهەشت هەست پێدەکات ، بۆ هەندێکی تر بۆنی بەهەشت هەست پێدەکات لە دووری پێنج سەد ٥٠٠ ساڵ ) هەر لەناو گۆڕەپانی مەحشەردا بڕاوادارن هەست بەبۆنی بەهەشت دەکەن



## پەروەردگار بەهەشتی هێنایە قسەکردن !

بەهەشت دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی پەروەردگار وە پەروەرێن هێناویەتە قسەکردن وەکو چۆن هەموو شتێکی هێناوەتە قسەکردن بەم شێوەیە :-

بەهەشت و دۆزەخ بوو بە دەمەقاڵەیان

دۆزەخ وتی : بۆچی هەر خۆبەزل زان و زۆردارەکان فڕێدەدرێنە ناو منەوە ؟

بەهەشتیش وتی : بۆچی منیش هەر لاوازو هەژارو پەکەوتەکان نەبێت هیچ کەسێکی تر نایەتە ناو من ؟

خوای گەورەش بەبەهەشتی فەرموو : تۆ ڕەحمەتی منیت و دەتکەمە خەڵات بۆ ئەو بەندانەم کە خۆم دەمەوێت

وە بەدۆزەخی فەرموو : تۆ سزای منیت و دەتکەمە سزا بۆ ئەو بەندانەی کە خۆم دەمەوێت وە هەردووڵاتان دەبێت پڕبکرێن

هەرکەسێک لەدونیادا داوای بەهەشت بکات لەخوا سێ جار بەهەشت دەڵێت : ئەی پەروەردگار بیکەرە ناو بەهەشتەوە ، بەهەشت دەڵێت ئەی پەروەردگار فلان بەندەی تۆ داوای منی کرد تۆش بیکەرە ناو بەهەشتەوە

بەهەشت خۆی تامەزرۆی بەندە چاکەخوازەکانە



خوای گەورە دیوارەکانی بەهەشتی دروستکردووە بەخشتی ئاڵتوون و زیو عەرشەکەی (عەرشی بەهەشت) بەدەستی خۆی داناوە وە پێشی فەرموو قسە بکە ؟ ئەویش وتی بڕواداران سەرفراز بوون ( کاتێک فریشتەکان تەماشای جوانی بەهەشتیان کرد پێیان وت : مژدەت لێبێ ئەی جێگای پادشاکان ).



## ئایا فراوانی گەورەیی بەهەشتەکەی پەروەردگار چۆنەو چەندە؟

خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە پانتایی بەهەشت بەئەندازەی پانتایی و فراوانی ئاسمانەکان و زەوییە لە ئایەتی ١٣٣ ی ال عمراندا

**تێبینی/** ئەمە وەڵامێکی حاشا هەڵنەگرە بۆئەوانەی وادەزانن زەوی گۆییە بەڵکو زەوی تەختەو زۆر فراوانە بەجۆرێک کە بەهەشت هێندەی ئاسمانەکان و زەوی فراوانە چونکە ئاسمان وەک سەقفێک بیناکراوە بەسەر زەوی فراوان و تەخت و جێگیردا واتە چۆن ناتوانین بگەینە کۆتایی ئاسمان بەهەمان شێوە ناتوانین بگەینە کۆتایی زەوی تەخت ، بۆیە پەروەردگار پانتایی بەهەشتی شوبهاندووە بە پانتایی ئاسمانەکان لەگەڵ پانتایی زەویدا وە هەرگیز ناگونجێت پەروەردگار لە وەسفی فراوانی بەهەشتدا زەوییەکی گۆیی بچوکی نوقمی ناو ئاسمانێکی گەورەو فراوان لەگەڵ ئاسمانێکی فراوان و گەورەدا کۆبکاتەوە

بەنمونە بەخاترەوە وەک ئەوەیە بڵێی فراوانی بەهەشت هێندەی هەموو خاکی عێراق و هەڵماتێکی بچوکە !

فراوانی ئاسمان وەک فراوانی زەوییە چونکە ئاسمان بیناکراوە بەسەر زەویدا ، ئێمە و گیانەوەران و ڕووەکەکان و قاڕەو دەریاو زەریاکان لەناو خانەیەکی بچوکی ئەم زەوییە فراوان و گەورەیەدا ئەژین وە خۆر و مانگ بچوکن و بەسەر ئەم خانەیەدا ئەسوڕێنەوە



لە بەهەشتدا ١٠٠ پلە هەیە وە هەر پلەیەکی بەئەندازەی نێوان ئاسمان و زەوییە ، فراوانی بەهەشت لە گەورەیی کۆشک و تەلارو درەختەکان و بەروبوومەکانیدا دەردەکەوێت بەم شێوەیە

لەنێوان ئەملاو لای تاکە دەرگایەکی بەهەشتدا ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی ٤٠ ساڵە

فراوانی بەهەشت بەجۆرێکە کە خاوەن باوەڕ چادرگەیەکی هەیە لە مرواری ناوبۆش بەرزیەکەی و درێژیەکەی ٦٠ میلە واتە ١٠٠ کیلۆمەتر

فراوانی بەهەشت بەجۆرێکە کە درەختی وای تیایە کاتێک ئەسپ سواری تیژڕەو ماوەی ١٠٠ ساڵ لەژێر سێبەرەکەیدا بڕوات تەواو نابێت

فراوانی بەهەشت بەجۆرێکە کە گەڵاکانی داری (سدرة المنتهى) بەئەندازەی گوێی فیلێک دەبێت و بەروبوومەکەیشی وەکو کوپەڵەی گەورە گەورە وایە

فراوانی بەهەشت بەجۆرێکە کە هێشووە ترێیەکانی ناوی هێندەی ماوەی فڕینی یەک مانگی قەلەڕەشێکی پەڵاوییە لەم سەرەوە بفڕێت بۆ ئەوسەری بەبێ وەستان

فراوانی بەهەشت هێندە گەورەیە کاتێک پەروەردگار خەڵکانێک لە ئاگری دۆزەخ دەردەکات و ڕەحمیان پێدەکات ئەیانکاتە ناو بەهەشتەوە .... یەکێک لەوانە ئەتوانێ میوانداری هەموو کەسانی





دونیا بکات و خواردن و خواردنەوەو جێگەیان پێ ببەخشێت بەبێ ئەوەی هیچ لەبەشەکەی خۆی کەم بکات

بەهەشت هێندە فراوانە بەجۆرێک کە یەکەم تاقمی ئەهلی بەهەشت کاتێک دەچنە ناوی دەعوەت دەکرێن بە زیادەی جگەری حوت و گا کە ٧٠ هەزار کەس لێی دەخوات

فراوانی بەهەشت بەجۆرێکە نزمترین کەسی ناو بەهەشت ئەو موڵکەی پێی ئەدرێت ١٠ هێندەی هەموو موڵکی دونیایە کە پانتاییەکەی بەقەد ماوەی ١٠٠ ساڵە کە بەچاوی خۆی دەیبینێت

فراوانی بەهەشت بەجۆرێکە کە ژمارەی ئەو مسوڵمانانەی دەچنە ناوی ئێجگار زۆرە لەهەموو ئومەتەکان ، لەناویشیانا ئومەتی محمد علیه الصلاة والسلام کە یەکەم تاقمیان کاتێک دەچنە بەهەشت ژمارەیان ٧٠ هەزار کەسەو خوای گەورە ئەوەی بەخشیوە بەو ئومەتە کە لەگەڵ هەر یەکێک لەو ٧٠ هەزار کەسە ٧٠ هەزار کەسی تر بچێتە ناو بەهەشتەوە

واتە ژمارەی مسوڵمانانی ئومەتی موحەمەد کە دەچنە بەهەشتەوە بریتیە لە ٤ ملیارو ٩٠٠ ملیۆن مسوڵمان ،

لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردگار بەتکای پێغەمبەرو چەندەهای زیاتر دەردەکات لە دۆزەخ ونیشتەجێی بەهەشتیان دەکات ،

هەروەها بەتکای پێغەمبەران و فریشتەکان و شەهیدەکان و پیاوچاکان و مسوڵمانەکان ژمارەیەکی زۆرتر دەچنە ناو بەهەشت،



هەروەها خوای گەورە بەڕەحمی خۆی سێ مشت لە دۆزەخ دەردەکات ودەیانکاتە ناو بەهەشتەوە کە ئەو مشتانە لە ژمارە نایەن و ناتوانرێت سەرژمێری بکرێن تەنها خوای گەورە خۆی دەزانێت چەنێک ئەبن

ئیمامی عمر خوای گەورە لێی ڕازی بێت دەفەرموێت ( خوای گەورە بەتوانایە بە یەک مشت هەموو خەڵکان بخاتە ناو بەهەشتەوە لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا بەهەشت پڕ نابێت ، تاکو خوای گەورە کەسانێکی تری بۆ دروست دەکات

پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام دەفەرمووێت بەردەوام لەناو بەهەشت چۆڵی هەیە هەتاوەکو خوای گەورە کۆمەڵە کەسانێکی تری بۆ دروست دەکات و نیشتەجێیان دەکات و ئەو چۆڵیەی بەهەشت بەوان پڕ دەکاتەوە

لەم بەشەوە بۆمان دەرکەوت کە فراوانی و پانتایی بەهەشت چەنێ گەورەیە بەگوێرەی پانتایی ئاسمانەکان و زەوی و ئەهلەکەی و کۆشک و تەلارو بەروبووم و میوەو درەختەکانی ناوی ... هتد



## خەڵکان لەبەردەم کانیاوەکان و دەرگاکانی بەهەشتدا مقۆ مقۆیانە !

دوای ئەوەی خەڵکان لە ئاوی حەوزی کەوثەر دەخۆنەوە ڕادەوەستن و چاوەڕوانی چوونە ناو بەهەشت دەکەن ، بەهەشت بەرامبەریانە و لە دوورەوە دەیبینن دەرگاکانی داخراوە

دواتر خەڵکان هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیاندا مقۆ مقۆی ئەوەیانە کە کێ دەرگای بەهەشتیان بۆ بکاتەوە ، لەناو یەکدا دەگەڕێن بۆ کەسێک کە دەرگاکانی بەهەشتیان بۆ بکاتەوە ،

خەڵکان لەوێدا بەئادەم (علیه سلام) ئەڵێن : (ئەی باوکی ئێمە داوای چوونە ناو بەهەشتمان بۆ بکە ) ئەویش ئەڵێت : ( ئەی ئێوە بەهۆی هەڵەکەی باوکتانەوە لەبەهەشت نەکرانە دەرەوە ! من خاوەنی ئەو کارە نیم ). ... بەڵام بڕۆن بۆلای نوح (علیه سلام)، دەچن بۆلای نوح و ئەویش دەڵێت : من دوعاو نزایەکم کرد لەوانەی کە لەسەر زەویدا دەژین و سەرجەم هەموو لەناوچوون

بەڵام بڕۆن بۆلای پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه سلام) دەچن بۆلای ئیبراهیم وئەویش دەڵێت : (من خاوەنی ئەو کارە نیم ) من سێ درۆم کردووە .

**تێبینی/** لە کتێبی (قیامەت ڕووداوەکان و گۆڕانکاریەکان) ( باسی ئەو ٣ درۆیەم کردووە کە هەموو یەکێک لەوانە بۆ پارێزگاری بووە لە دینەکەی خوا و لە ئەسڵدا درۆ نەبووە )



پاشان پێغەمبەر ئیبراهیم دەڵێ بڕۆن بۆلای پێغەمبەر موسا (علیه سلام) دەچن بۆلای موساو ئەویش دەڵێت من خاوەنی ئەوە نیم من نەفسێکم کوشتووە ( بەهەمان شێوە لە کتێبی قیامەت باسم کراوە )

بەڵام بڕۆن بۆلای پێغەمبەر عیسا (علیه سلام) دەچن بۆلای عیسا علیه سلام و ئەویش دەڵێت : ( من خاوەنی ئەو کارە نیم ) من جگە لە خوا پەرستویانم ، بەڵام بڕۆن بۆلای پێغەمبەر محمد علیه الصلاة والسلام .

پاشان خەڵکان دێن بۆلای پێغەمبەر محمد (صلی الله علیه وسلم) دەڵێن : ئەی پێغەمبەری خوا تۆ خوای گەورە دەرگای هەموو چاکەیەکی بۆ کردوویتەتەوە و لێت خۆش بووە لەهەموو گوناهەکانی سەرەتاو دوایت ، وە تۆ ئەبینیت ئێمە لە چ حاڵێکداین تکامان بۆ بکە لای خوای گەورە ، ئەویش دەفەرموویێت : من ئەو هاوەڵەتانم ، لەوێدا پێغەمبەر دێتە دەرەوە و بەنێو خەڵکاندا دەڕوات و خۆی دەفەرموویێت ( ... من ئاڵای (حەمد و ستایشم) پێیە و دەڕۆم و خەڵکانیش لەگەڵ مندا دەڕۆن ، تا دەگەمە بەردەرگای بەهەشت )

هەروەها دەفەرموویێت ( من دەڕۆم تا دەگەمە ژێر عەرش ...)، ( ... دواتر خوای گەورە دام دەنێت  لە جێگەیەک کە لەپێش من کەس بەو جێگەیە نەگەیشتووە و دوای منیش کەس پێی ناگات ... داوای ڕێگە پێدان دەکەم لە خوای گەورە و ڕێگەم پێ دەدات (( من دەچمە بەردەم خوای گەورە و پێشوازیم لێ دەکرێت ..وە

بە ڕوخساری خوای گەورە لە ڕوومدا شاد دەبم و ... کاتێک کە دەیبینم  یەکسەر کڕنووشی بۆ دەبەم و دەچمە سوجدەبردن ، دواتر خوای گەورە چەندین سوپاس و ستایشی جوانم دەخاتە دڵەوە کە پێشتر بە هیچ کەسێکی نەبەخشیوە وە دواتر بەهیچ کەسێکی تری نابەخشێت

لەوێدا من بەو سوپاس وستایشە جوانە سوپاس و ستایشی خودا دەکەم ... لەوێ لێم دەگەڕێن لە سوجدەدا دەمێنمەوە تا ئەو کاتەی خوای گەورە ویستی لێیەتی ، پاشان دەوترێت : .... ئەی محمد سەرت بەرزبکەرەوە بڵێ گوێت لێ دەگیرێت ، داوا بکە تا داواکەت بۆ جێبەجێ بکرێت ، تکا بکە تا تکات لێ وەربگیرێت ، منیش سەر بەرزدەکەمەوە و دەڵێم : خوای گەورە ئومەتەکەم ئومەتەکەم ، دەوترێت: ئەی موحەمەد ئەوانەی لە ئومەتەکەتدا لێ پرسینەوەیان لەسەرنیە لە دەرگای لای ڕاستی دەرگاکانی بەهەشتەوە بیانکەرە ژوورەوە ، وە ئەوانەش بەشدارن لەگەڵ خەڵکانی تردا لەدەرگاکانی تری بەهەشتدا .

ئەو پێغەمبەرە نازدارە دەفەرموویێت ( ... وە من یەکەم کەس دەبم کە دەچم بۆناو بەهەشت بەبێ شانازی ، ئەڵقەی دەرگای بەهەشت بەدەست دەگرم و دەیلەرێنمەوە ... لەوێدا داوای دەرگا کردنەوەو چوونە ژوورەوە دەکەم ، دەرگاوانی بەهەشت پێم دەڵێ : کێی تۆ ؟ منیش دەڵێم : محمد ، ئەو دەڵێت بەخێر هاتی محمد ، فەرمانم پێکراوە لە پێش تۆ دەرگا بۆ کەس نەکەمەوە ... دەرگام بۆ دەکەنەوەو پێشوازیم لێ دەکەن و بەخێرهاتنم دەکەن



پاشان هەموو مسوڵمانان و خەڵکانی ئەهلی بەهەشت بەدوای پێغەمبەری خوادا دەچنە ناو بەهەشتێکەوە کە خۆشترینی خۆشیەکانە هەتاهەتاییە و ئەوەی هەم و غەم و خەم و ترس و نارەحەتی بێتاقەتی بێت تیای نیەو ئیتر ژیانی ڕاستەقینەی پڕ لە خۆشیەکان بۆ هەتا هەتایە لێرەوە دەست پێدەکات و ئەو بەهەشتانە پڕن لە خۆشی و نازو نیعمەت و باخ و باخات و ڕووباروو و باڵەخانەو ڤێلاو کۆشک و قەسرو کەشتی و باخیرەی ئاڵتوون .. هتد .. وە بەجۆرێکن و هێندە پێشکەوتوون کە چاوەکان نەیانبینیوە گوێکان نەیانبیستووەو و بە خەیاڵ و ختورەش بەدڵەکاندا نەهاتوون...

هەروەک کاتێک لە ئیمامی احمد ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەپرسن ( کەی ئیسراحەت دەست پێدەکات ؟ ئەویش دەفەرمووێت ( بەیەکەم هەنگاوی قاچت کە دەیخەیتە ناو بەهەشتەوە ) .

یەکەم ئومەت کە دەچنە ناو بەهەشتەوە بریتیە لە ئومەتی موحەمەد علیه الصلاة والسلام کە باشترین ئومەتن وە ئومەتی باشترین پێغەمبەرن وە لەناویشیاندا یەکەم کۆمەڵ کە دەچنە ناو بەهەشتەوە ئەو ٧٠ هەزار کەسەن بەبێ لێپرسینەوە دەچنە ناو بەهەشتەوە هەموویشیان دەستی یەکیان گرتووە و بەیەکەوە دەچنە ناوییەوە ، ئەمانە ئەو ٧٠ هەزار کەسەن کە خوای گەورە پەیمانی دابوو بە پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم

هیچ جیاوازی و ڕق و کینەو بوغز لە نێوانیاندا نیە دڵەکانیان دڵی یەک پیاوە ڕوویان دەدرەوشێتەوە وەک درەوشانەوەی مانگی چواردە

## ئایا ئەو ٧٠ هەزار کەسە کێن کە بەبێ لێپرسینەوە ئەچنە بەهەشتەوە ؟



ئەوانەن کە داخ بەکارناهێنن، ئەوانەن کە داوا لە برا مسوڵمانەکانیان ناکەن کە دوعایان بەسەرا بخوێننەوە وە هیچ شتێک بەشوم نازانن وە پشت وپەنایان تەنها بەخوای خۆیانە

هەژارە کۆچکارەکان لەوێدا پێشڕەوی ئەو کۆمەڵەن کە دەچنە بەهەشت چونکە ئەمانە (لەدونیادا) هەموو کەلێنێکیان پێ پڕ دەکرایەوە وە هەموو نارەحەتیەکیان پێ دوور دەخرایەوە ، ئەوانە بەئاواتی خۆیان سەریان دەنایەوە و نەیان دەتوانی بەدی بهێنن ، خوای گەورە بە فریشتەکانی خۆی دەفەرمووێت بڕۆن پێشوازیان لێ بکەن ، فریشتەکان دەڵێن : ئەی خودایە ئێمە نیشتەجێی ئاسمانەکانی تۆین وە چاکترین دروستکراوانی تۆین ئایا فەرمانمان پێدەکەیت کە بچینە لای ئەوانەو سەلامیان لێ بکەین ؟ خوای گەورە دەفەرمووێت : ئەوانە بەندەی من بوون دەیان پەرستم و هیچ هاوتایان بۆ بڕیار نەدەدام وە هەموو کەلێنێکیان پێ پڕ دەکرایەوە و هەموو نارەحەتیەکی ڕۆژگاریان پێ دوور دەخرایەوە ، یەک لەوانە دەمرد و هیواکانی لەناو سنگیدا بوو نەیدەتوانی بیهێنێتە دی ، فریشتەکانیش لەوێدا لەهەموو دەرگاکانەوە پێشوازیان لێ دەکەن و دەڵێن : سەلامتان لێ بێت بەهۆی ئارام گریتانەوە گەیشتنە چاکترین دوا هەوارگەتان .

لەو ڕۆژەدا (مەبەست لە ڕۆژی قیامەتە) خوای گەورە بانگی بەهەشت دەکات و ئەویش بە خۆڕازاندنەوە و جوانیەکانیەوە دێت و خوای گەورە دەفەرموویێت : لەکوێن ؟ بەندەکانی من ئەوانەی لە پێناوی مندا بەشەڕ هاتوون و شەڕیان لەگەڵ کراوەو ئازاردراون و کوژراون با بچنە ناو بەهەشتەوە ، و ئەوانیش لەوێدا دەچنە ناو بەهەشتەوە بەبێ لێپرسینەوە پاشان فریشتەکان دێن و سوجدە بۆ خوای خۆیان دەبەن و دەڵێن : ئەی پەروەردگارمان ئێمە شەو و ڕۆژ تەسبیحات و سوپاسی تۆ دەکەین و بەگەورەت دەزانین ، ئەمانە کێن کە پێش ئێمەت خستوون ؟ خوای گەورە دەفەرموویێت : ئەوانە ئەو کەسانەن کە لەپێناوی مندا بەشەڕ هاتوون و شەڕیان لەگەڵ کراوە و ئازاردراون ، فریشتەکانیش لەهەموو دەرگاکانەوە پێشوازیان لێ دەکەن و دەچنە لایان و پێیان دەڵێن : ( سلام علیکم بما صبرتم ) واتە (( سڵاوتان لێ بێت بۆ ئارام گرتن و خۆڕاگریتان ))

باسەکەمان گەیشتە ئەو ساتەی کە مسوڵمانان بەپێی پلەیان کۆمەڵ کۆمەڵ دەچنە ناو بەهەشتەوە و لەپێش هەموویشیانەوە هەژارە کۆچکارەکانن بەجیاوازی ماوەی ٤٠ ساڵ یاخود ٥٠٠ ساڵ پێش دەوڵەمەندەکانیان دەچنە ناو بەهەشتەوە (والله اعلم)

ئومەتی ئیسلام (باوەڕداران) هەموو کۆدەبنەوە لە قیامەتداو دەوترێت : کوا هەژارانی ئەم ئومەتە ؟ ( ئەوانیش واتە هەژاران) دێن و پێیان دەوترێت ئێوە چیتان دەکرد ؟ ئەوانیش دەڵێن : ئەی پەروەردگار تاقیکراینەوەو ئارامان گرت ، سەروەت

و سامان و خێرو دەسەڵاتت بەخشی بەغەیری ئێمە، خوای گەورەش دەفەرمووێت: ڕاستتان کرد: دەفەرمووێت: ئەنجا بچنە ناو بەهەشتەوە پێش هەموو خەڵکان .

ئەم هەژارو کەم دەستانە زۆرینەی ئەهلی بەهەشتن هەر لەبەرئەوەشە پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام هەمیشە لە پاڕانەوەکانیدا دەیفەرموو : ئەی پەروەردگارم بەهەژاری بمژێنەو بەهەژاری بمرێنەو لەگەڵ ڕیز و کۆمەڵی هەژاراندا کۆم بکەرەوە . ( پێغەمبەری خوا دوعای بۆ ئومەتەکەی کردووە کە لەماڵی دونیا خودا کەمیان پێ ببەخشێت تاکو لەو کەسانە بن کە پێشدەکەون بۆ چوونە ناو بەهەشت کە فەرموویەتی :

( ئەی پەروەردگارم هەر کەسێک باوەڕی بەتۆ هێناوە وە شایەتی داوە کە من نێردراوی تۆم بەیەک گەیشتنەوەی خۆتی لا خۆشەویست بکەیت وە قەزاوقەدەری لەسەر سوک بکەیت وە ماڵی دونیای کەم پێ ببەخشیت ، وە هەر کەسێک باوەڕی بەتۆ نیە و باوەڕی بە ڕەوانەکردنی من نیە لەلایەن تۆوە خوای گەورە تۆش بەیەک گەیشتنی خۆتی لا خۆشەویست نەکەیت و قەزاو قەدەری خۆتی لەسەر سوک نەکەیت و ماڵی دونیای زۆری پێ بدەیت )

کۆچکارەکان لە ڕۆژی دواییدا دێنە بەردەم دەرگای بەهەشت وە دەرگایان بۆ دەکرێتەوە و دەرگاوانی بەهەشت پێیان دەڵێت : ئایا خوای گەورە لێپرسینەوەی لەگەڵدا کردن ؟ ئەوانیش دەڵێن لە کام شت لێمان بپرسێتەوە ؟ ئێمە شمشێرەکانمان بەردەوام بەسەر

شانمانەوە بوو لە پێناوی خوادا دەجەنگاین تاکو لەسەر ئەوە مردین. دەفەرمووێت ئینجا دەرگای بەهەشتیان بۆ دەکرێتەوە پێش ئەوەی خەڵکان بچنە ناوی بە چل ساڵ ئەوان تیایدا دەحەوێنەوە .

لەناو هەزارە کۆچکردووەکانیشدا ئیمامی ئەبوبکری سدیق خوای گەورە لێی ڕازی بێت یەکەم کەسە کە دەچێتە ناو بەهەشتەوە لە ئومەتی ئیسلامدا

پێدەچێت سەرجەم مسوڵمانانی بەهەشت بە چل ٤٠ ساڵ بچنە ناو بەهەشتەوە .

وە لەدوای هەزارە کۆچکارەکانیش ئەنسارییەکان دەچنە ناو بەهەشتەوە .

ئەم هەزارانە فریشتەکان پێشوازیان لێدەکەن کاتێ دەچنە ناو بەهەشتەوە و دەورەیان ئەدەن وە خوای گەورە لە زیادەی جگەری نەهەنگ خواردنیان دەداتێ (٧٠ هەزار لێی دەخوات) وە لە ڕووباری سەلسەبیل ئاویان پێ نۆش دەکات ، پاشان گایەکی بەهەشتیان بۆ سەردەبڕێت کە لەتەنیشتی و لای بەهەشتدا دەلەوەڕێت ...))

پاشان ئەم هاوەڵە بەڕێزانە لە کۆچکارەکان و ئەوانی تر جێگەی خۆیان دەگرن لەبەهەشتدا خۆیان و هاوسەرو خێزانەکانیان و نەوەکانیان پێش هەموو مسوڵمانانی تر بەگشتی .

**تێبینی/** ئەو ٧٠ هەزارەی کە بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە هەموویان هەزارە کۆچکارەکان نین بەڵکو هەزارە کۆچکارەکان

دەستەیەکن لەو ٧٠ هەزار کەسە ، چونکە لەناویاندا مسوڵمانی سەردەمەکانی دوای سەردەمی پێغەمبەری خوای تیایە تا ڕۆژی قیامەت (والله اعلم)

دوای ئەوەی کە ٧٠ هەزاری یەکەم دەچنە ناو بەهەشتەوە لەدەستەی ئەوانە هەژارە کۆچکارەکانن کە دەچنە ناو بەهەشتەوە پاشان ئەو کەسانە بانگ دەکرێن بۆ بەهەشت کە بەنهێنی و ئاشکرا سوپاس گوزاری خوایان کردووە لە خۆشی و ناخۆشیدا

پاشان ئەو مسوڵمانانەی تر کە ماون لە ئومەتی پێغەمبەر علیە صلاة والسلام دەچنە ناو بەهەشت کە ئەوان پێش هەموو ئومەتەکانی تر دەکەون چونکە باشترین ئومەتن ، وە خوای گەورە تایبەتمەندی کردوون بەڕێزی زیاتر چونکە پێغەمبەرەکەیان باشترین پێغەمبەرەو ئومەتەکەشی زۆرینەی کەسانی ناو بەهەشتن

لێرەدا تایبەتمەندییەک هەیە بۆ ئافرەتان پێغەمبەری خوا دەفەرموویێت ( گەر ئافرەت هەر پێنج نوێژە فەرزەکەی کرد و مانگەڕۆژووەکەی بەڕۆژوو بوو ، داوێنی پاراست و فەرمانی مێردەکەی جێ بەجێ کرد ، پێی دەوترێت : بچۆرە ناو بەهەشتەوە لەهەر دەرگایەکەوە کە خۆت پێت باشە ) .

(( ئەهلی بەهەشت ١٢٠ ڕیزن هەشتایان لەم ئومەتەن وە ٤٠ ڕیزەکەی تر لە ئومەتانی پێشووترن )) .



## (ماددەی ڕۆژ) تایبەت بە هەینی
## (نەك خۆر) دەخرێتە بەهەشتەوە !



تێبینی/ سەرەتا بزانە لە قورئانی پیرۆزدا شەو و ڕۆژ ماددەن و مەخلوقن و جوڵەو خولگەو سیفەتی تێهەڵکێشان و چوونەسەریەک و هەندێ تایبەتمەندی تریان هەیە بەڵام لە زەوی گۆییدا ئەمانە هیچی بوونی نیە چونکە شەو ئەو رووەی تۆپەکەیە کە پشتی لە خۆرەو ڕۆژیش ئەو رووەی تری تۆپەکەیە کە بەرامبەر بە خۆرە ( لەبەرئەوە سیستەمی زەوی گۆیی راست نیەو خورافیاتە)

لەدەستەی ئەو کەسانەی کە خوای گەورە دەیانخاتە ناو بەهەشتەوە لەدوای جنۆکەو مرۆڤ ڕۆژەکانە بەتایبەتی ڕۆژی جومعە ، وە لەگەڵ ڕۆژی جومعەشدا تەنها بانگ بێژان لە ئومەتی محمد دەچنە ناو بەهەشت . بەم شێوەیە :

( خوای گەورە ڕۆژەکان وەک شێوەی خۆیان زیندوو دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ، وە لەناو ئەو ڕۆژانەدا ڕۆژی جومعە زیندوو دەکاتەوە سپی و پرشنگدارە ، خاوەنەکانی دەورەی لێدەدەن و لێی کۆدەبنەوە وەکو بوکێک بەرێدەکرێت و دەچن بەرەو بەهەشت ، لەژێر ڕۆشناییەکەی ڕۆژی جومعەدا دەڕۆن ، ڕەنگیان وەک بەفری سپی وایە و بۆنیان وەک بۆنی میسک بڵاودەبێتەوە و لەشاخەکانی کافور بەرێدەکەون و هەموو جنۆکەو مرۆڤ سەیریان دەکەن ، چاوییان داناخەن ، تاکو ئەوان دەچنە ناو

بەهەشتەوە ، کەس تێکەڵیان نابێت ، تەنها ئەو بانگ بێژانەی کە لەبەرخوا بانگیان داوە ) .

تێبینی/ پاش تێڕوانین لە فەرموودەکە واتە ( خەڵکان تەنها سەیری بانگ بێژەکان دەکەن و چاوییان لێ ناتروکێنن کاتێ کە دەچنە ناو بەهەشتەوە لەگەڵ ڕۆژی جومعەدا ) چونکە بانگ بێژەکان لەهەموو کەسانێک سەربەرزو گەردن بەرزترن لە ڕۆژی قیامەتدا)) .

وردبین بە کە خۆر لە رۆژی قیامەتتدا دەخرێتە دۆزەخەوەو وە ماددەی ڕۆژ (بەتاییبەتی رۆژی هەینی) دەخرێتە بەهەشتەوە



## منداڵە مردووەکان لای
## دەرگاکانی بەهەشت چاوەڕێ دەکەن !

وە لای دەرگاکانی بەهەشت منداڵی باوەڕداران کە بەمنداڵی مردوون چاوەڕوانی دایک و باوکیان دەکەن ( پێیان دەوترێت بڕۆنە ناو بەهەشت دەڵێن : تا باوک و دایکمان نەچێت ئێمەش ناچین ، خوای گەورە دەفەرموویت (( ئەوە بۆچی دوورە پەرێزن بڕۆنە ناو بەهەشت ئەوانیش دەڵێن : خوای گەورە ئەی باوکان و دایکانمان ، خوای گەورەش پێیان دەفەرمووێت : بڕۆنە ناو بەهەشت خۆتان و باوک و دایکتان )) .

و لەوێدا دەرگای بەهەشت بۆدایک و باوکیان دەکەنەوە . ئەو منداڵانە دەستی دایک و باوکیان دەگرن و تا دەیانخەنە ناو بەهەشتەوە ، منداڵەکان گەشتیاری ناو بەهەشتن هەریەکێکیان کە بەباوکی یاخود بە باوک و دایکی دەگات دامێنی کراسەکەی یاخود دەستی دەگرێت ...... بەری نادات تاوەکو خوای گەورە هەردووکیان دەخاتە ناو بەهەشتەوە .

پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام دەفەرمووێت ( سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەو منداڵە کۆرپەیەی کە لەسکی دایکی کەوتۆتە خوارەوەو لەبارچووەو مردووە بەو (وێڵاشە) پەتەی کە بەناوکیەوە بەستراوە دایکی ڕادەکێشێت بۆناو بەهەشت ئەگەر ئارام بگرێت و چاوەڕێی پاداشت بێت لەسەری .

**تێبینی/** کەواتە ئەمە گەورەترین مژدەیە بۆ ئەوکەسانەی کە منداڵیان وەفاتی کردووە ئەگەر ئەو دایک و باوکانە بەهەشتی بن منداڵەکانیان لای دەرگاکانی بەهەشت چاوەڕێیان دەکەن .

کاتێک مسوڵمانان دەچنە ناو بەهەشتەوە هەر کەسێک لەوان دەڕوات بۆلای (مەملەکەتەکانی خۆی ) لە کۆشک و تەلارو (باڵەخانەو ڤێلاکان) ی جێگاکەی خۆی کە بۆی ئامادەکراوە ، وە ماڵی خۆی دەناسێتەوە وەکو چۆن لەدونیادا ماڵی خۆی دەناسێت، چۆن ؟

وەڵام/ مرۆڤی بەهەشتی کە لە دونیادا دەمرێت و وەفات دەکات واتە نەقڵی جیهانی بەرزەخ دەبێت لەوێ لەناو گۆڕەکەیدا هەموو بەیانی و ئێوارەیەک مەملەکەتەکانی خۆی نیشان دەدرێت لەبەهەشتدا ( بەنمونە وەک شاشەیەک بیهێننە بەردەمی و بۆی لێبدرێتەوە هەموو بەیانی و ئێوارەیەک )

هەروەها خوای گەورە دەفەرموویێت { ويدخلهم الجنة عرفها لهم } سورة محمد اية : ٦

{ واتە دەیانکاتە ئەو بەهەشتەی کە پێی ناساندوون} .

ئێستا ئەهلی بەهەشت هەموو چوونەتە ناو بەهەشتەوە هەموویان دەڕۆن بەرەو مەملەکەتەکانی خۆیان کە ئەو مەملەکەتانە زۆر زۆر گەورەن بەجۆرێک نزمترین کەسی ناو بەهەشت (کۆتاهەمین کەسە کە لە دۆزەخ دێتە دەرەوە ) ١٠ دە هێندەی هەموو موڵکی سەر زەوی مەملەکەت و نیشتیمانی گەورە گەورەی پێ دەدرێ ، ئەی دەبێت کەسە پلە بەرزەکان چیان پێ بدرێت !؟

## دوو کتێب یاخود دوو تۆمارگەی زۆر گەورە

باسێکمان بیرنەچێت ئەویش ئەوەیە :-

خوای گەورە ناوەکانی ئەهلی بەهەشتی لە کتێبی زۆر بەرزدا تۆمارکردووە ( لە تۆمارگە هەر بەرزەکاندا ) بەم شێوەیە :

پێویستە ئەمە بزانیت !

مرۆڤ کاتێک لە جیهانی دونیادا وەفات دەکات (واتە لە دونیاوە نەقڵ دەبێ بۆ جیهانی بەرزەخ ) ئەگەر بەهەشتی بووبێت و عاقیبەت خێربووبێ ئەوا ڕۆحی مردووەکە دەکرێتە تابوتێکەوە لەلایەن فریشتە ڕووخۆش و ڕوو سپیەکانەوە بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمان و فریشتەکانی هەموو ئاسمانەکان سڵاوی لێ دەکەن و دەڵێن ئەمە کێیە ئەم بۆنخۆشە هەڵگرانی تابوتەکەش دەڵێن ئەمە فڵانی کوڕی فڵانە بەخۆشترین ناو بانگی لێدەکەن کە خۆی لەدونیادا پێی خۆش بووە بانگی پێ بکەن ... وە یەک یەک دەرگای ئاسمانەکانی بۆ دەکرێتەوە تا ئاسمانی حەوتەم... هتد ... { تاکو ڕۆحی مردووەکە دەگەیەنرێتە ئاسمانی حەوتەم ، خوای گەورە دەفەرموویت : من لەم بەندەیەم ڕازی بووم  و ناوی ئەم بەندەیەم بنوسن لەکتێبی هەرەبەرزدا .... وە دەنوسرێت لە تۆمارگەی هەرەبەرزەکاندا ....

وە کاتێک ڕۆحی بێ باوەڕێک دەکرێتە تابوتی ڕۆحەوە لەلایەن فریشتە ڕووگرژو توڕەو مۆنەکانەوە هەڵدەگیرێت و بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمانی یەکەم و فریشتەکانی ئاسمانی یەکەم دەڵێن ئەوە کێیە ئەم بۆن ناخۆشە (ڕۆحی ئەم بێدینە بۆگەنی دێت ) هەڵگرانی تابوتەکەش دەڵێن ئەمە فلانی کوڕی فلانە بەناخۆشترین شێوە بانگی لێدەکەن کاتێک ڕۆحی ئەم مرۆڤە کافرە دەگاتە لای دەرگای ئاسمانی یەکەم دەرگای لێ ناکرێتەوەو پاشان خوای گەورە سەبارەت بەڕۆحی ئەم بێ باوەڕ دەفەرموویێت : لێی ڕازی نەبووم و ناوی ئەم بەندەیەم لە تۆمارگەی (سجین) لەهەرە خوارووی زەویدا تۆمار بکەن .....} ئیتر لەوێوە ئەم ڕۆحە فڕێ دەدرێتە خوارەوە تا زەوی حەوتەمی خوارەوەی تەبەقەی سجین ناوەستێ (والله اعلم) ... هتد

**تێبینی** / دوو کتێب هەیە کە ناوی بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکانی تیادا تۆمارکراوە کە ناوی ئەو دوو کتێبە یەکیان (علیین)ە کە ناوی بەهەشتیەکانی تێدا تۆمارکراوە و ناوی کتێبەکەی تر (سجیین)ە کە ناوی دۆزەخیەکانی تێدا تۆمارکراوە ، لە کتێبی (علییندا ) بەهەشتیەکان ناوی باوکیان و هۆزەکانیانی لەگەڵدا نوسراوەو وە مۆری لێ دراوە کە نە لێی زیاد دەکرێت وە نەلێی کەم دەکرێت



## ڕووداوێکی سەرنج ڕاکێش !!!

عبدالله ی کوڕی عمر خوای گەورە لێی ڕازی بێت دەڵێت پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام هات بۆلامان و دوو کتێبی بەدەستەوە بوو ( وەک نمونە ) فەرمووی بەو کتێبەی بەدەستی ڕاستیەوە بوو ( ئەمە کتێبی خوای پەروەردگارە ناوەکانی ئەهلی بەهەشتی تیایە ناوی خۆیان و باوکیان و هۆزەکانیان پاشان هەڵگیراوە و کۆتایی پێ هاتووە نە لێی زیاد دەکرێت و نەلێشی کەم دەکرێت ) پێدەچێت لەوێدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دوو کتێبی وەک نموونە نیشان دابن چونکە پێغەمبەرانیش عليهم صلاة والسلام ناوی بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان و ژمارەیان نازانن، وە لەبەشی قەدەری شەرعیدا ئەگەر کۆمەڵە کردارێک هەبوو هەر کەس کردەوەی پێکرد خوای گەورە لە ئەهلی بەهەشت ناوی تۆمار دەکات

وە لە ئەبی سعیدی خدرییەوە خوای گەورە لێی ڕازی بێت گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی پێنج کردار هەن هەر کەسێک لە ڕۆژێکدا ئەنجامیان بدات ئەوا خوای گەورە لە ئەهلی بەهەشت ناوییان تۆمار دەکات هەرکەسێک سەردانی نەخۆشێک بکات وە ئامادەی بەڕێکردنی جەنازەیەک ببێت وە ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بێت وە نوێژی جومعە جێ بەجێ بکات وە بەندەیەک ئازاد بکات ) .

ڕێگای بەهەشت بەشوێنکەوتنی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بەدەست دێت و بەتایبەتی پێغەمبەری ئازیزو خۆشەویستمان محمد علیه الصلاة والسلام ( هەندێ فریشتە هاتن بۆلای پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتێکدا کە نوستبوو

هەندێکیان وتیان : ئەوە نوستووە

هەندێکیشیان وتیان : نەخێر چاوی نوستووە بەڵام دڵی بەئاگایە

وتیان ئەو هاوەڵەتان نمونەیەکی بۆ بهێننەوە

پاشان وتیان : نمونەی ئەو وەک نمونەی پیاوێک وایە خانوویەکی دروست کردبێت و سفرەو خوانێکی تێدا دروست کردبێت و خەڵکانی بۆ بانگ کردبێت گەر هەرکەسێک بێت بەدەنگی ئەو بانگهێشتەوە ئەوا دێتە ئەو خانوەوە و لەو سفرەو خوانە دەخوات بەڵام گەر نەهات ئەوا نایەتە ئەو خانوەوە و لە وەلیمەکەش ناخوات

پاشان وتیان : ماناکەی بۆ لێک بدەنەوە تا تێی بگات

هەندێکیان وتیان : ... خانووەکە بەهەشتەو بانگ خوازەکە موحەمەددە علیه الصلاة والسلام هەرکەسێک گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکات ئەوا گوێڕایەڵی خوای کردووە وە هەر کەسێک سەرپێچی محمد بکات علیه الصلاة والسلام ئەوا سەرپێچی خوای کردووە ، وە پێغەمبەریش جیاکەرەوەیە لەنێوان خەڵکاندا ( واتە باوەڕهێنان بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و شوێن کەوتنی جیاکەرەوەی نێوان بێ باوەڕو باوەڕدارە ) .

**تێبینی/** هەر کەسێک ناوی پێغەمبەری علیه الصلاة والسلام لەلا هێنراو سەڵاواتی لەسەر نەدا ئەوا بەڕاستی ڕێگای بەهەشتی ونکردووە بۆچی ؟ چونکە هەر شتێک تۆ کە فێری دەبیت و بەرنامەی ژیانتی پێ دروست دەکەیت و پاشان مەملکەتەکان و نیشتیمانەکانی ناو بەهەشتی پێ بەدەست دێنیت بەهۆی ئەو پیاوەوەیە علیه افضل الصلاة والسلام کە سەڵاوات بریتیە لە دوعاکردن و داواکردن لە پەروەردگار بۆ بەندەکەی محمد صلى الله علیه وسلم

یەکێکی تریش لە ڕێگاکانی تر بۆ چوونە ناو بەهەشتەوە بریتیە لە گرتنەبەری ڕێگایەک بۆ فێربوونی زانستی شەرعی چونکە پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام دەفەرموویت هەرکەسێک ڕێگەیەک بگرێتە بەر بۆ بەدەستهێنانی زانستێک ، خوای گەورەش ڕێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات ) ... لەڕیوایەتێکی تردا ... خوای گەورە بەڕێگەیەکدا دەیبات تا دەیگەیەنێتە ناو بەهەشت ... ))

## ئەبێ ناو ئەو بەهەشتە چەنێ پێشکەوتوو بێت لە ڕووی تەکنەلۆژیای ئیلاهیەوە ؟



خەڵکان چوونە بەهەشتەوە هەموویان بەرەو مەملکەتەکان و نیشتیمانەکانی خۆیان دەڕۆن و هەریەکەشیان نیشتیمان و ماڵی خۆی دەناسێتەوەو ڕێگەکەی پێ دەزانێت وەک چۆن لە دونیادا ڕێگای ماڵی خۆی دەزانێت چۆن ؟

چونکە کاتێک ئەم بەهەشتیانە لە جیهانی بەرزەخدا بوون هەموو بەیانی و ئێوارەیەک جێگەو مەملکەتەکانی خۆیان نیشان دەدرا تا ڕۆژی زیندووبوونەوەیان لە ڕۆژی قیامەتدا

ئەم خەڵکانە پێگەو شوێن و پلەی مەملکەتەکانیان جیاوازە بەپێی کردەوە چاکەکانیانە کە پێیان دەبەخشرێت چونکە بەهەشت ١٠٠ پلەیە نێوانی هەردوو پلەیەکی بەهەشت وەک نێوانی زەوی و ئاسمان وایە کە ماوەی ١٠٠ ساڵە ، هەتا هەندێ لە جێگەکانی ئەهلی بەهەشت وەکو ئەستێرەیەکی دوور لە ئاسمان دەبینرێت

ئەهلی بەهەشت خاوەن کۆشکەکان و مەملەکەتەکانی ناو بەهەشت لەسەر و خۆیانەوە دەبینن وەکو ئەستێرەیەکی پرشنگداری ڕۆیشتوو لە ئاسۆی ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوای بەرزی ئاسماندا بەهۆی جیاوازی نێوان پلەکانیان )) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوانە جێگەی پێغەمبەرانن و کەسی تر جگە لەوان پێی ناگات ، فەرمووی : بەڵێ سوێند بەوەی کە نەفسی

منی بەدەستە ئەوە پلەی کەسانێکە کە باوەڕیان بەخوای خۆیان هەبووەو پێغەمبەرانیان بەڕاست زانیوە )) .

تێبینی/ ناو بەهەشت زۆر زۆر گەورەیە بەجۆرێکە کە ئاسمانی حەوتەم وەک ئەڵقەیەک وایە کە فڕێدرابێتە ناو بیابانێکی گەورەوە لەچاو بەهەشتدا ، .... ئاسمانی شەشەمیش لەچاو ئاسمانی حەوتەم وەک ئەڵقەیەک وایە کە فڕێدرابێتە ناو بیابانێکی گەورەوە ... بەو شێوەیە تا دەگاتە ئاسمانی یەکەم کە وەک ئەڵقەکە وایە لەناو بیابانێکی گەورەدا لەچاو ئاسمانی دووەمدا ، ئینجا تەسەوڕی گەورەیی بەهەشت بکەن ئەبێ چەند بێت . !!!

ئەوەشمان بیرنەچێت دیمەن و دروستکراوەکانی ناو بەهەشت زۆر زۆر پێشکەوتووە چونکە پەروەردگار کە خاوەنی عیلمی



هەتا هەتایی و ناکۆتایە خۆی بەزاتی گەورەیی خۆی دروستی کردووەو ڕازاندویەتیەوە هێندە پێشکەوتووە کە چاوەکان تا ئێستا نەیانبینیوە و گوێیەکان نەیانبیستووە بە خەیاڵ و ختورەش بە دڵەکاندا نەهاتووە ،



بیهێنە پێش چاوی خۆت شارێکی وەک ئەوەی ناو وێنەکە ڕازاوەیەو مرۆڤە ئەندازیارەکان کە زانستێکی سنورداریان هەیە و خوای گەورە بەو کەمە زانستەی کە پێی بەخشیون توانیویانە شارێکی ئاوا ڕازاوە بونیاد بنێن ئایا ئەبێ مەملەکەتەکانی ناو بەهەشت و کۆشک و تەلارو باڵەخانەکانی چەنێ ڕازاوە بێت کە پەروەرێن بە عیلمی بێ کۆتاو تواناو قودرەت و دەسەلاتی خۆی هێنابێتیە بوون و ڕازاندبێتیەوە !!!



هەربۆیە پەروەردگار خۆی دەفەرموویّت { پێشبڕکێ بکەن بۆ لێخۆشبوونی خواو دەستخستنی بەهەشتێک کە پانتاییەکەی وەک فراوانی ئاسمان و زەوییە ئامادەکراوە بۆ کەسانێک کە بڕوایان بەخواو پێغەمبەرەکانی هێناوە ئەوەش بەخشینی خوایەو دەیبەخشێتە ئەوانەی کە خۆی ویستی لێیەتی خوای گەورەش خۆی خاوەنی بەخشینی هەرە گەورەیە }

مەملەکەتەکان و نیشتیمانەکانی بەهەشت هێندە گەورەو جیاوازن لەڕووی پلەوە بەجۆرێک کاتێک یەکێک لە کەسانی هەرە پلە بەرزی ( علیین ) سەر دێنێتە دەرو تەماشای بەهەشت دەکات لە پەنجەرەو دەلاقی کۆشکەکانیەوە لەوکاتەدا هەموو بەهەشت ڕووناک دەبێتەوە و بەهەشتیەکان دەڵێن : ئەوە پیاوێکی (علیین) بوو تەماشای بەهەشتی کردوو هەموو لایەک ڕووناک بۆوە .

**تێبینی/** ئەبێ ناو ئەو بەهەشتە چەنێ پێشکەوتوو بێت لەڕووی تەکنەلۆژیای ئیلاهیەوە کە بەکردنەوەی پەنجەرەی کۆشکی یەکێک لە نیشتەجێبووانی بەهەشتانی (علیین) هەموو بەهەشت ڕووناک ببێتەوە !!!؟؟ یاڕەبی بەنسیبمان بکەیت

ئەبێ چ سیستەمێکی هاتووچۆی پێشکەوتوو لەو بەهەشتانەدا دامەزرێنرابێت کە خەڵکانی پلەبەرزەکان بەچوونە ناو بەهەشت پێی بڕۆن بۆ مەملەکەتەکانی خۆیان لە مەملەکەت و نیشتمانەکانی چینە هەرەبەرزەکانی بەهەشتدا !!! ئەبێ چ سیستەمێکی پێشکەوتوویی ئیلاهی تیادا دامەزرێندرابێت لە نورو ڕوناکیە ڕەنگاو ڕەنگ و سەرنج ڕاکێشەکان !!!

پێغەمبەر موسا علیە سلام پرسیاری لە پەروەردگار کرد کە نزمترین پلەی بەهەشت چۆنە ؟

فەرمووی : پیاوێک دێت دوای ئەوەی کە ئەهلی بەهەشت چوونە ناو بەهەشتەوە ، پێی دەوترێت بچۆرە ناو بەهەشت : ئەویش دەڵێت : چۆن ئەی پەروەردگار دوای ئەوەی خەڵکان هەموو جێگەو بەشی خۆیان وەرگرتووە لەناو بەهەشتدا ؟ پێی دەوترێت : ئایا ڕازی دەبیت تۆش بەوێنەی پاشایەک لە پاشاکانی دونیات پێ بدرێت ؟ دەڵێت : بەڵێ ڕازیم ، خوای گەورەش دەفەرموویێت : ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەی هاوشێوەی ئەو بۆ تۆ ، دەفەرموویێت : لە پێنجەم جاردا دەڵێت ڕازیم ئەی پەروەردگار ، خوای گەورەش دەفەرموویێت : هەمووی بۆتۆ لەگەڵ دە ئەوەندەی تردا و چی نەفست پێی خۆشەو چاوت پێی خۆشە بۆت دابین کراوە ، ئەویش دەڵێت ڕازیم ئەی پەروەردگار .

پاشان پێغەمبەر موسا علیە سلام فەرمووی ئەی پەروەردگار ئەی بەرزترین پلە بۆ کێیە ؟

خوای گەورەش فەرمووی : بۆ کەسانێکن کە من بەهەشتەکانیانم لەبەر ڕێزی ئەوان ( بەدەستی خۆم دروستکردووە ) و مۆرم بەسەردا ناوە و کەس نەیبینیوە وە کەسیش نەیبیستووە و بەخەیاڵی کەسیشدا نەهاتووە .

**تێبینی/** ئەبێ ئەو بەهەشتە پلە بەرزانە لە چ ئاستێکی خۆشیدا بن بەجۆرێک پەروەردگار بەدەستی خۆی دروستی کردبن و مۆری بەسەردا نابن و هەستەوەرەکان هەستیان پێی نەکردبێ تا ئێستا



!!! ئەبێ چەنێ پێشکەوتوو و ڕازاوەبن ئەبێ لە چ ئاستێکی خۆشی و دڵڕفێنیدا بن ئەبێ چۆن زەخرەفە کرابن !!! یا الله لەوانە بین کە ئەو پلە بەرزانەمان بەنسیب بکەیت

بەرزترین پلە لەناو بەهەشتدا بریتیە لە ( وەسیلە ) (( پلەیەکە لای خوای گەورە کە لەسەر و ئەو پلەیەوە هیچ پلەیەکی تر نیە...)) کە پلەی پێغەمبەری خوایە علیه الصلاة والسلام ، ئەوەش ئەو پلەیەیە کە پێغەمبەری خوا داوای لە ئومەتەکەی کردووە لەدوای هەموو بانگێک تکاو ڕجای بەدەستهێنانی بۆ بکەین ، پێغەمبەری نازدار دەفەرموویێت علیه الصلاة والسلام ( گەر گوێتان لە بانگ بێژ بوو چی وت ئێوەش وەکو ئەو بیڵێنەوە و پاشان سڵاواتم لەسەربدەن هەرکەسێک سەڵاواتم لەسەر بدات خوای گەورە دە سڵاواتی لەسەر دەدات ... پاشان داوای وەسیلەم بۆ بکەن چونکە وەسیلە جێگەیەکە لەبەهەشتدا ئامادەکراوە بۆ تەنها بەندەیەک لەبەندەکانی خودا ،هیوادارم ئەو بەندەیەش من بم .... )

ابن عباس ڕەحمەتی خوای لێبێ لە وەسفی وەسیلەو شوێنی پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام دەفەرموویێت ( خوای گەورە هەزار کۆشکی مرواری بەخشیە پێغەمبەرەکەی لەهەموو ئەو کۆشکانەدا هاوسەرو خزمەتکاری تایبەتی خۆی تێدایە ) .

وەسیلە لە سەرو فــیردەوسـەوەیە فــیردەوسیش لەســەروی بەهەشتەوەیە ...

بەهــەشت ١٠٠ پــلەیە... و هــەرەبەرزەکــەی فــیردەوسە و ناوەڕاستەکەشی فیردەوسە وە عەرشیش لەسەرو فیردەوسەوەیە)

وەسیلە ( بەرزترین پلەی فیردەوس ) ..ە

وە لە خوار وەسیلەوە شوێن و پلەو پایەی پێغەمبەران هەیە وە لەو شوێنەشدا شوێنی خۆشەویستی خوا پێغەمبەر ئیبراهیم علیە سلام ی لێیە

پێغەمبەری خوا علیە صلاة والسلام دەفەرموویێت لەبەهەشتدا کۆشکێک هەیە لە مرواری دروستکراوە هیچ شکاوی و خواریەکی تیانیە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ ئیبراهیم علیە سلام

وە نزمتر لە شوێن و جێگەی پێغەمبەران لە بەهەشتدا بریتیە لە شوێن و جێگەی شەهیدان و ڕاستگۆیان ، بەجۆرێک یەکێک لە کەسانی بەهەشت لە جێگە بەرزەکەی خۆیەوە سەیری بەهەشتیەکان دەکات وەکو ئەستێرەیەکی پرشنگدار دەردەکەوێت ( ابو بکر و عمر بەشادیەوە لەوانن )

پیاوێک هات بۆلای پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام وتی : ئەی پێغەمبەری خوا گەر شایەتی بدەم کە تەنها یەک خوا هەیەو تۆش پێغەمبەری خوایت وە نوێژە فەرزەکان ئەنجام بدەم و زەکات ببەخشم ، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرم و شەونوێژەکانی تیا ئەنجام بدەم من لەکامانە دەبم ؟ پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم فەرمووی (( تۆ لەڕیزی ڕاستگۆیان و شەهیدان دەژمێردرێیت )) .



وێنەکان بریتیە لە بونیادنانی عەبدەکانی پەروەردگار بەو زانستە کەم و سنوردارەی کە پێی بەخشیون ... ئەی ئەبێ زاتی ئیلاهی خۆی کە بەدەستی خۆی بەهەشتی بونیاد ناوە چ تەکنەلۆژیاو ڕازاوەیی و خۆشی و دڵڕفێنیەکی تیادا بونیاد نابێ !!!



## ئایا پلە بەرزەکانی مەملەکەت و وڵاتەکانی ناو بەهەشت بۆ کێیە ؟



خەڵکان چوونە بەهەشتانێکەوە کە زۆر گەورەن و پێشکەوتوویان هێندە مەزنە بەهۆی تەکنەلۆژیایی ئیلاهیەوەیە چونکە پەروەرێن بەدەستی خۆی دروستی کردوون بەهەشتانێک کە پڕ لە خۆشی و نازو نیعمەتە هەموو تاکێک بە گوێرەی پلەی ڕاستگۆیی و ئیخلاس و کاروکردەوە زۆرو چاکەیان پلە جیاوازەکانی ئەو مەملەکەتانەیان پێ بەخشرا بەجۆرێک نزمترینیان کە کۆتا کەسی ناو دۆزەخ بوو کاتێک هاتە دەرەوەو کرایە ناو بەهەشتەوە ئەوا ١٠ هێندەی هەموو موڵکی سەر زەوی مەملکەتی پێ بەخشرا لە خاکی بەهەشتی پڕ لە کۆشک و نازو نیعمەت

**١/** لەو بەهەشتە شیرینەدا سەد ١٠٠ پلە هەیە کە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ موجاهیدەکان (تێکۆشەرەکان) ئەوانەی کە لە پێناوی خوای گەورەدا دەجەنگن دژ بە دوژمنانی بێ باوەڕ وە ماوەی نێوانی هەر پلەیەک لەو پلانە هێندەی نێوانی ئاسمانەکان و زەوییە .... وە هەروەها ئەو تیرهاوێژە دڵسۆزانەی لە جەنگی دژ بە دوژمناندا تیریان هاویشتووە ئەوانیش لە پایە بەرزانی بەهەشتن .

**تێبینی/** جیهاد تەنها بەمانای جەنگی قیتال نایەت بەڵکو هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە کە بە وتەو نوسین و وتار و گەیاندنی ئەم پەیامەی پەروەردگار دەجەنگن و کۆشش دەکەن

پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرموویەتی (( هەرکەسێک تیرێک بگەیەنێتە دوژمن ، خوای گەورە پلەیەک بەرزی دەکاتەوە ... بەڵام ماوەی نێوانی دوو پلە سەد ساڵە ))

دەربارەی ئەوانەی لەسەنگەری بەرگریدا وەستاون لە ڕووی دوژماندا :

پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام دەفەرمووێت ( ئێشک گرتنی تەنها ڕۆژێک لەسەنگەری ڕووبەڕوو بوونەوەدا دژ بەدوژمنانی خوا باشترە لە عیبادەت و وەستانی هەزار ڕۆژ لە جێگەکانی تردا ) .... هەروەها دەفەرمووێت ( هەرکەسێک تەنها شەوێک ئێشک بگرێت و بمێنێتەوە لەسەنگەری ڕووبەڕووبوونەوە لەپێناوی خوادا پاداشتی وەک هەزار شەو ڕۆژ وایە کە شەوەکانی سەرتاسەر بەشەونوێژ بردبێتە سەر و ڕۆژەکانیشی بەڕۆژوو بووبێت ) .

٢/ لەو بەهەشتە پڕ لەنازو نیعمەتەدا کەسانێک هەن کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بەیەکەوە دەچنە بەهەشتەوە ئەوانیش ئەوانەن کە منداڵی بێ باوکیان گرتۆتە ئەستۆی خۆیان ، پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام ئیشارەتی بۆ دوو پەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوەڕاستی خۆی کرد .

( ئەبێ لەوە خۆشتر هەبێ هاوڕێی پێغەمبەری نازدار بێت کاتێک دەچیتە بەهەشتەوە !!! ) .

٣/ پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام دەفەرمووێ ( باشترینی شەهیدەکان لای خوا ئەوانەن کە لەڕیزی پێشەوەی شەڕدا

دەجەنگن و ئاورِ بەملاولادا نادەنەوە تا دەکوژرێن ئەوانە کامەران و خۆشگوزەران دەبن لە نهۆم و تاوەرە بەرزەکانی ناو بەهەشت)

**٤/** لەو ڕۆژەدا ئەوانەی هاوەڵایەتی قورئانیان کردووەو لەبەریان کردووەو کردەوەیان پێکردووە بەردەوام پێداچوونەوەیان پێداکردووە پێیان دەوترێت بخوێنەرەوەو بەرزبەرەوە وەکو چۆن تۆ لەدونیادا دەتخوێندەوە ، پلەی تۆ لای دوا ئایەتە کە دەیخوێنیت) .

**تێبینی/** پلەکانی بەهەشت فراوانیان هێندەی نێوان ئاسمانەکان و زەوییە بۆیە بۆ نمونە وەک ئەوە وایە سواری هۆکارێکی گواستنەوەت بکەن بەنمونە فڕۆکەیەکی ناوبەهەشت و ئەم فڕۆکەیە بە خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان ئیش بکات ( واتە سوتەمەنی ئەو فڕۆکەیە خوێندنەوەی ئایەتەکان بێت کە لەبەرتکردووە ) کە لەزاری تۆوە دەردەچێت و بەرزت دەکاتەوە تا ئەو ئاستەی کە تۆ دوا ئایەت دەخوێنی کە لەبەرت بووەو کردەوەت پێکردووە لەوێدا تۆ سوتەمەنی ( ئایەتی ترت پێ نەماوە کە زیاتر پێی بەرزبیتەوە بۆ مەملەکەتە بەرزەکانی تری ناو بەهەشت )

**٥/** لەو بەهەشتە گەورانەدا خوای گەورە پلەی بەندەی چاکەخوازی خۆی وا بەرزدەکاتەوە تیایدا ، ئەو کەسە دەڵێت : ئەی پەروەردگار ئەم پلە بەرزەم بەهۆی چیەوە پێ بەخشرا ؟ خوای گەورەش دەفەرمووێت : ئەوە بەهۆی داوای لێخۆشبوونی منداڵەکەتەوە بوو کە لەدونیادا بۆی کردیت لەدوای خۆت )

٦/ لەو ڕۆژەدا کەسانێک کە باوکێکی بڕواداری پلە بەرزیان هەبووە ئەوا خوای گەورە پلەی نەوەو منداڵە بڕوادارەکانیشیان بەرزدەکاتەوە بۆلای پلەی ئەو باوکە بڕوادارانە هەرچەندە لەخوار پلەی خۆشیانەوە بێت بۆئەوەی ئەو باوکە بڕوادارانە زیاتر دڵخۆش بن... وەک خوای گەورە لە سورەتی طور ئایەتی ٢١ دا دەفەرموویێت { پاداشتی باوکەکانمان کەم نەکردووە بەوەی بەخشیومانەتە منداڵەکانیان }

٧/ لەو بەهەشتە پڕ لە خۆشیانەدا کەسانی (توشبووان بەبەڵاو ناخۆشی لەدنیادا ) هێندە پلەیان بەرزو گەورەیە بەجۆرێک خۆشگوزەرانەکانی دنیا لە قیامەتدا کاتێک دەیانبینن (بەڵادارەکان) چ پاداشتێکیان بۆهەیە ئەوانیش خۆزگە دەخوازن لە دونیادا گۆشتەکانیان بە مقاش پارچە پارچە بکرایەو ئەوانیش ببونایەتە خاوەنی هەمان پاداشت )

٨/ ئەوانەی زۆر سوجدە دەبەن بۆ خوای گەورە بەو سوجدە بردنەیان ئەو کەسانە پەروەردگار پلەیەک بەرزی دەکاتەوە لەناو بەهەشتدا

٩/ کۆمەڵە کەسانێک هەن هەمیشە زکری خوا دەکەن لەسەر فەرشە ڕاخراوەکان خوای گەورە دەیانخاتە ناو بەهەشتی بەرین و بەرز چونکە لە ڕۆژی کۆتاییدا (مرۆڤ) ئەم کارەی لەسەروو هەموو کارەکانی بەندەکانی ترەوە دەبێت جگە لە پێغەمبەران و ئەوانەی ئەو یادەیان لەو زیاتر خوێندبێت



تێبینی/ مەبەست لە فەرشی ڕاخراو والله اعلم پێی نازو نیعمەت و دەوڵەمەندیە ( زکری خوای گەورە زۆر بکەن ئەگەرچی دەوڵەمەندیش بیت و لەنازو نیعمەتی زۆردا بوویت لە دونیادا ) ، ئەوانەی کە دەوڵەمەندیەکەیان مەشغوڵیان نەکردوون و زیکری خوای گەورەی لەیاد نەبردوونەتەوە

١٠/ کەسانێک هەن کە پێشبڕکێ دەکەن لە چوونیان بۆ نوێژی جومعەو یادکردن ئەوانە خوای گەورە پێش کەسانێکی تریان دەخات بۆ چوونە ناو بەهەشتەوە کە خۆیان دواخستووە لە نوێژی جومعە ، واتە هەرکەسێک پێشبڕکێی زوو ڕۆیشتن بکات بۆ نوێژی جومعەو زکرو یادکردنی پەروەردگار ئەوا لە قیامەتیشدا پێش هەموو ئەو کەسانە دەکەویت کە خۆیان دواخستووە لە ڕۆیشتن بۆ نوێژی جومعە

پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام دەفەرموویت ( ئامادەبن بۆ نوێژی جومعە و لە ئیمام نزیک ببنەوە ، پیاوی وا هەیە لە ئەهلی بەهەشتە بەڵام خۆی لەنوێژی جومعە دوادەخات تا ئەویش دوادەخرێت لەبەهەشت هەرچەند ئەو کەسە ئەهلی بەهەشتیش بێت )

١١/ پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دەفەرموویت (دەوڵەمەندەکان و پارەدارەکان نزمترین پلەو پایەیان هەیە لە ڕۆژی کۆتاییدا مەگەر تەنها ئەوانەیان نەبێت کە بەهەر دوو مشتیان بەهەر چوارلایاندا پارەیان بەخشیوەو بەحەڵاڵ پەیدایان کردووە و زۆر کەمیشیان بەوجۆرەن )






## شاخ و چیا بۆنخۆشەکانی ناو بەهەشت !

بیهێنە پێش چاوەکانی خۆتان چوونەتە ناو بەهەشتانێکەوە کە هێندە جوان و ڕازاوەن چاوەکان لە ئاست جوانی ئەو بەهەشتانەدا کوێرن دڵەکان مردوون و گوێیەکان کەڕن ... بۆچی ؟

چونکە جوانی ئەو بەهەشتانەو ڕازاوەییەکەیان تەنها کەمێکی لێ باسکراوە لەچاو گەورەیی ئەوێ و نازو نیعمەتەکانی ناویدا کە پێمان گەیشتووە لە قورئان و فەرمووده شیرینەکاندا ... ئەوەی کە من لەم بابەتەدا باسی دەکەم تەدەبورێکە لە هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانە کە باس لە خۆشی و ڕازاوەیی ناو ئەو بەهەشتانە دەکات

لەبەهەشتی فیردەوسی بەرزدا شاخ و چیاکانی بریتین لە میسک ( میسک پێکهاتەیەکی زۆر بۆنخۆشە) بەجۆرێک هەر چوار ڕووبارەکەی ناو بەهەشت لەژێر ئەو چیا میسکانەوە هەڵدەقوڵێت

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی ( کۆرپەی مردووی موسوڵمانان لە شاخێکن لەناو بەهەشتدا ئیبراهیم و سارا چاودێریان دەکەن تاوەکو دەیسپێرنەوە بە خاوەنەکانیان لە ڕۆژی قیامەتدا (واتە دوای چوونە بەهەشتیان )



وێنەکان بریتین لە چیاو رووبارەکانی دونیا!

ئەی دەبێ شاخ و چیاو رووبارەکانی ناو بەهەشت چۆن بن!



هەروەهــــا دەفـــەرمووێت: مـــینبەرەکەی من لەبـــەرزاییەکە لە بەرزاییەکانی بەهەشت

## ڕووبارە تایبەت و نمونەییەکان
## کە لەشاخەکانەوە هەڵدەقوڵێن !

بیهێنە پێش چاوەکانی خۆت چیا ناوازەو گەورەکانی بەهەشتی فیردەوسی اعلا لە بۆنی خۆشی میسک دروستکرابن و گەورەترین چوار ڕووبارەکەی بەهەشت لەوێوە هەڵقوڵێن و کە بریتین لە (ڕووباری ئاوی سازگاری تێکنەچوو ، ڕووباری شیر و ڕووباری هەنگوینی پاڵاوتەکراو ، ڕووباری شەرابی پاک و بەلەزەت ) بۆ ئەوانەی کە دەینۆشن

پەروەردگار لە سورەتی محمد لە ئایەتی پێنجدا دەفەرموویێت { نموونەی ئەو بەهەشتەی کە مژدە دراوە بە بەندە ملکەچەکانی خوا تیایدا هەیە لە چەندەها ڕووبار لە ئاوی سازگاری تێکنەچوو ، وە چەندەها ڕووباری شیر کە تامیان تێک ناچێت ، وە چەندەها ڕووبار لە شەرابی پاک و بەلەزەت بۆئەوانەی کە دەینۆشن ، وە چەندەها ڕووبار لەهەنگوینی پاڵاوتەکراو ، وە لەهەموو جۆرە میوەیەک لەگەڵ مسۆگەربوونی لێخۆشبوونی خوای گەورە بۆیان}

لەبەهەشتدا دەریای ئاو و دەریای هەنگوین و دەریای شەراب هەیە پاشان ڕووبارەکانی لێ بەش بەش دەبن واتە هەر یەکێکیان دەریان و دەبنەوە بە ڕووبارو بەش بەش دەبن

ڕووبارەکانی تری ناو بەهەشت بریتین لە سەیحان و جەیحان و نیل و فوڕات پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام دەفەرموویێت (

.... سیدرة المنتهی م پێ نیشان درا له ئاسمانی حەوتەم ، نەبکەکانی وەک کوپەڵەکانی هەجەر وابوو وە گەڵاکانی وەک گوێچکەی فیلەکان وابوو ، لەژێر قەدەکەیەوە دوو ڕووباری ئاشکراو و دوو ڕووباری شاراوە دەردەچوو ، وتم ئەی جبرەئیل ئەوە چیە ؟ فەرمووی: ئەو دوو ڕووبارە شاراوەیە هی بەهەشتن ئەو دوو ڕووبارە ئاشکرایەش نیل و فوڕاتن ) .

پێغەمبەری نازدار دەفەرموویێت علیه الصلاة والسلام ( چوومە ناو بەهەشتەوە بینیم ڕووبارێک دەڕوات لێوارەکانی چادری مرواری بوو دەستێکم کێشا بە ناویدا وتم بزانم چیە سەیرم کرد هەر میسکی سافە وتم: ئەوە بۆ کێیە ئەی جبرەئیل ؟ فەرمووی: ئەوە ئاوی کەوسەرە کە خوای گەورە بەخشیویەتی بەتۆ ) .

ئاوی کەوسەر ڕوبارێکە بەسەر ڕووی زەوی ناو بەهەشتدا دەڕوات و پێویستی بەجۆگەلە نیە لەچاڵدانیەو جۆگەلەی لێ نەبۆتەوە ، لێوارەکانی لە قوبەی گەوهەر و مرواری ناوبۆش و لە ئاڵتوونن ، ڕێڕەوەکەیشی بەسەر یاقوت و گەوهەردا دەڕوات، چەو و زیخەکەی موارین ، گڵەکەی لە میسک بۆنخۆشترە ، ئاوەکەی زۆر ساردترە لەبەفر نەرمترە لە کەرە شیرین ترە لە هەنگوین وە سپی ترە لە شیر وە بۆن خۆشترە لە میسک هەرکەسێ قومێکی لێ بخواتەوە هەرگیز تونی نابێت وە هەرگیز ڕووی ڕەش ناکرێت .

**بیرخستنەوە/** بەهەشت ١٠٠ پلەیە وە فیردەوس بەرزترین پلەیانە کە ناوەڕاستی بەهەشتە هەر چوار ڕووبارەکەش لەوێوە هەڵدەقوڵێت و دێت و عەرشی خوای گەورە لەسەرویانەوەیە گەر داواتان لە خوا کرد داوای فیردەوسی لێ بکەن

لەوانەیە بەهەشتی عەدەن لە نزیکی بەهەشتی فیردەوسی اعلا بێت یاخود لە ژێرەوەی بێت چونکە ڕووبارەکان لە فیردەوسەوە بۆ بەهەشتی عەدەن تێدەپەڕن و پاشان بۆ بەهەشتەکانی تر .

ئەو ڕووبارانە لەبەهەشتی عەدەنەوە دەڕژێن پاشان دەبنە چەند ڕووبارو جیادەبنەوە

لەناو بەهەشتدا چەندانی تر لە کانیاو هەیە وەک خوای گەورە دەفەرموویت { ان المتقين في جنت وعيون }

بەڕاستی خۆپارێزەکان لە تاوان و کوفر لە شکۆو پێگەی الله تعالى لەناو (نیشتیمان و وڵاتەکان) ی ناو باخاتەکانی بەهەشت و کانیاوەکانیدان



وێنەکە جوانی سروشتی دونیایە ! ئەی دەبێ جوانی سروشتی بەهەشت چۆن بێت !؟

## کانیاوە تایبەتیەکانی ناو نیشتمانەکانی بەهەشت

**سەل سەبیل /** ئاوێکی جوان و ڕەوان و خۆش و بەگوێرەی ئارەزووی بەهەشتیەکانە

**سەرچاوەکانی تەسنیم /** کانیەکە لە بەهەشتدا بۆ کەسە زۆر نزیکەکانی خوایە بەپوختەیی و بەبێ ئەوەی هیچی تری تێکەڵ بکرێت دەیخۆنەوە بەڵام بۆ کەسانی ( اصحاب اليمين ) بەتێکەڵکراوی لەگەڵ ئاوی تردا دەیخۆنەوە

کانیەکانی بەهەشت بەپێی خواست و داواکردنی خاوەنەکانیان هەڵدەقوڵێت وە خۆیان چۆنیان بوێت و لەهەر کاتێکدا ئارەزوویان لێ بێت هەڵی دەقوڵێنن



## کەشتی و باخیرە ئاڵتوونیەکانی ناو دەریا و ڕووبارەکانی بەهەشت

تۆ کاتێک مەملەکەتانێکی گەورەت پێ دەبەخشرێت لەناو بەهەشتدا ڕووباری گەورە گەورەی تیایە کە کەشتی ئاڵتوونی و زیویان تیادا ئامادەکراوە

قال تعالى { وَلَهُ الْجَوَارِ الْمُنشَآتُ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ } سورة الرحمن (٢٤)

ئەبێ باخیرەو کەشتیەکانی ناو ڕووبارەکانی بەهەشت چەنێ جوان و ڕازاوەو پێشکەوتووبن کە پەروەردگاری بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی خۆی هێناونیەتی بوون بەگەورەیی خۆی

تەسەوڕبکەن ئەم کەشتیانەی ناو وێنەکە مرۆڤەکان دروستیان کردووەو دیزاینیان کردووە بەو عیلمە کەمەی پێیان دراوە





بەقسەم بکەن نوێژەکانتان بکەن و خوای گەورە بەتەنها بپەرستن شوێن عەقڵی دوو مولحیدی نەخۆش مەکەون و ئەم بەهەشتە خۆشانە لەدەست خۆتان مەدەن



## باخ و بێستانە ئاڵتوون و زیوەکانی ناو بەهەشتەکان !

لەم بەشەدا دێمە سەر باسی باخ و باخات و میوەو بەرو بوومی ناو بێستانەکانی نیشتمانەکانی ناو بەهەشت ( بەتایبەتی بەهەشتی عەدەن )

لەناو بەهەشتدا تەنها یەک باخی تیانیە بەڵکو چەندەها باخ و بێستانی زۆری تێدایە بەجۆرێک لە زیو و ئاڵتوونن بەهەموو کەل و پەلەکانی ناویانەوە

پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام بە دایکی حاریسەی فەرموو: ( ئەی دایکی حاریثە لەناو بەهەشتدا باخ و بێستانی زۆر هەیە وە کوڕەکەی تۆ فیردەوسی هەرە بەرزی بەدەست هێناوە )

پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا کە لەناو بەهەشتدا چوار باخ و باخاتی تێدایە وەک دەفەرموێت { و لمن خاف مقام ربە جنتان } وە هەروەها دەفەرمووێ { ومن دونهما جنتان } ... پێغەمبەری خواش صلی اللە علیە وسلم باسی ئەو باخ و باخاتانەی لە فەرموودە پیرۆزەکانیدا ڕوونکردۆتەوە کە دەفەرمووێت ( دوو باخیان لە زیوە بەهەموو ئەو کەل و پەل وپێویستیانەی ناوی ، وە دوو باخەکەی تریان لە ئاڵتوونە لەگەڵ هەموو ئەو کەل و پەل و پێداویستیەکانی ناوی )

تێبینی/ بیهێنە پێش چاوی خۆت کە تۆ مەملەکەتانێک یاخود چەند وڵات و نیشتیمانێکت پێ ببەخشرێت کە بیناو کەل و پەل و نهۆمە چەند قاتەکانی پێکهاتبن لە زیو و ئاڵتون و هەروەها لەناو باخ و باخاتی پڕ لە میوەو ڕووبارو دەریاو زەریا ... هتد بن

خوای گەورە لەناو بەهەشتەکاندا بەهەشتی عەدەنی بەدەستی خۆی دروستکردووە وەک عبدالله ی کوڕی عمر خوای گەورە لێی ڕازی بێت دەفەرمووێ ( خوای گەورە چوار شتی بەدەستی خۆی دروستکردووە : عەرش و قەڵەم و بەهەشتی عەدەن و ئادەم علیه سلام ، پاشان بەهەموو دروستکراوەکانی تری خۆی فەرموو : ببن وە هەموو بوون )

پەروەردگار (مەملەکەتەکان یاخود نیشتیمانەکانی) بەهەشتی عەدەنی داپۆشیوەو سەری ناوەتەوە بەمرواریەک بەجۆرێک کە نەهیچ چاوێک بینیویەتی ونەهیچ گوێیەک بیستوویەتی وە قەت بەدڵی کەسدا نەهاتووە کە هەرچی هەیە لە ئافرەت و بەروبووم و خواردنەوە تیایدایە و سەری ناوەتەوەو هیچ لە دروستکراوەکانی نەیان بینیوە نە جبریل و نە فریشتەکانی تریش بۆیە هیچ نەفسێک نازانێ چی بۆ شاردراوەتەوە لە بەختەوەری، پەروەردگار دەفەرمووێ ئامادەم کردووە بۆ بەندە چاکەخوازەکانم

## دارو درەختەکانی ناو
## سروشتە دڵڕفێنەکەی بەهەشت !

لەناو ئەو بەهەشتانەدا ترێ و هەنارو خورما و سیدر و وە جۆرەها میوەی زۆرتری تیایە

**دارخورماکانی ناو بەهەشت /** ڕەگەکانی لە مرواریەو لقەکانی ئاڵتوونە بەروبوومەکەی لە بەرزاییەکەیدایە ) هەروەها قەدەکانیشی لە زومورڕودی سەوزن و سەقفەکەشی پۆشاکی ئەهلی بەهەشتە ، بەروبومەکەی بەئەندازەی کوپەڵەو دۆڵچەکان دەبن کە لە شیر سپیترن وە لەهەنگوین شیرینترن لەکەرە نەرمترن وە ناوکیشیان تێدانیە

**درەختی سیدر /** کە درەختێکی دڕکاوییە بەڵام لەبەهەشتدا بێ دڕکە و خوای گەورە دڕکەکەی نەهێشتووە و لەجێی هەر دڕکێک بەرێکی لێ داناوە و ئەو بەرە حەفتاو دوو ٧٢ جۆر خواردنی لێ دروست دەبێ کە جۆراوجۆرن هیچیان ڕەنگیان لەیەکتر ناچێت ، گەڵاکانی درەختی سیدر بەگوێرەی ئەندازەی گوێی فیلێکە ، ( لەوانەیە هەندێکیان ) گەڵاکانی هێندە گەورەبن ئەم ئومەتەی پێ داپۆشێت ، هەروەها (هەیانە) گەڵاکانی بەئەندازەی کوپەڵەکانی هەجەر دەبوو کاتێک فەرمانێکی خودای پێگەیشت گۆڕا بۆ یاقوت و گەوهەرو زمروت یان هاوشێوەی ئەوان ،

**درەختی طوبا /** درەختێکی زۆر گەورەو بەرزە و ئاستی فیردەوسە وەکو دار گوێز وایە لەسەر قەدەکەی هەستاوەو لەسەرەوە بڵاوبۆتەوە ، درەختێکی زۆر گەورەیە کە سێبەرەکەی ١٠٠ ساڵ ڕێیە بەجۆرێک ئەسپی تیژڕەو ماوەی ١٠٠ ساڵ دەڕوات سێبەرەکەی تەواو ناکات ، (هەروەها بەهەمان شێوە ) پۆشاکی ئەهلی بەهەشت لەو درەختەوە دەردەچێت

وە تێکڕا هەموو قەدو پەلەکانی درەختەکانی بەهەشت ئاڵتوونە و گەڵاکانی ناوەرێت و میوەکانی بەردەوام بێ ناوکن هەمیشە سەوزو تێرئاون بەجۆرێک میوەکانی سەرجەم شۆڕ و نزیکن بۆ لێکردنەوە

درەختەکانی بەهەشت دەڕوێت بەزیکرکردن لەدونیادا ( هەرکەسێک بڵێت سبحان الله العظیم وبحمده دارخورمایەک ((یان درەختێکی)) بۆ دەڕوێت لەناو بەهەشتدا

وە گژوگیای ناو بەهەشت بۆنیان خۆشە بەتایبەتی گوڵە ڕێحانە وە گەورەی ڕێحانەی ئەهلی بەهەشت دار خەنەیە

بەهەشت جۆرەها میوەی بەتام و بەلەزەتی تیایە لەهەموو جۆرێک کە مرۆڤ حەزوو ئارەزووی بکات و بیانەوێت هەڵیبژێرن بەجۆرێک کە بەروبومەکەی بەردەوامەو گەر لێی بکەیتەوە تەواوبوونی بەسەردا نایەت واتە هەمیشەییە

میوەو بەروبوومەکانی بەهەشت لە میوەکانی دنیا ناچێت تەنها لە ناوەکانیاندا لەیەک دەچن واتە هیچ شتێک نیە لەبەهەشتدا لە شتانی دنیا بچێت تەنها لە ناودا وەک یەکن ، هەر جۆرە میوەیەک

دوو جۆرە توخمن ، وە بەروبوومی بەهەشت زۆر گەورەیە وە بەرزترە بەسەر بەروبومی دونیادا لە خواردن و بۆن و ڕەنگ و قەبارەیدا … بەجۆرێک گەورەیی هێشووە ترێکانی وەک ماوەی فڕینی قەلە ڕەشێکی پەلاوییە کە لە فڕیندا بێ توانا نەبێت و نەکەوێت وە گەورەیی دەنکە ترێیەکی هێندەی بەرانێک دەبێت . گەورەیی ئەم دەنکە ترێیە هۆزێک تێردەکات .

خۆشبەختەکانی بەهەشت واتە نیشتەجێیانی نیشتیمانەکانی بەهەشت لەهەموو ئەو میوانە دەخۆن و زۆر بەتام و چێژن وە ئەوانە زۆر ڕازین بەو ژیانەو بەوشێوە ئاسانەی کە ئەو خواردنانەیان تیادا دەست دەکەوێت ، ئەهلی بەهەشت لەبەروبومی بەهەشت دەخۆن بەدانیشتنەوە بەپێوە وە بە پاڵکەوتنەوە و چۆن خۆیان بیانەوێت

مادام لەناو بەهەشتدا لەناوچوون نیەو مردن نیە و ژیان هەتاهەتاییە بۆیە بەهەمان شێوە بەروبوم و میوەو خواردنەکانیشی هەمیشەیین و تەواوبوونیان نیە

پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام دەفەرمووێ بەهەشتم پێ نیشاندرا دەستم برد بۆ هێشویەک ترێ گەرم بمهێنایە لێتان دەخوارد هەتا کۆتایی دونیا و قەت تەواو نەدەبوو

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:(چاندنی درەختەکانتان زۆر بکەن لەبەهەشتدا چونکە ئاوەکەی سازگارەو خاکەکەی پاک و بەپیتەو ژمارەی درەختەکانی زیاد دەبێت بەزۆر وتنەوەی ((لاحول ولا قوة الا بالله))

خۆشەویست دەفەرمووێ ( ئەو شەوەی کە تیایدا شەوڕەویم پێ کرا گەیشتم بە ئیبراهیم وتی : ئەی محمد سەلامی من بگەیەنە بە ئومەتەکەت وە هەواڵیان بدەرێ کە بەهەشت خاکەکەی بەپیتە و ئاوەکەشی شیرینە وە چاندنی درەختەکانی بە وتنی ( سبحان الله و الحمدلله و لا اله الا الله و الله اكبر ) دەبێت . )



# تەماشای گەورەیی بەپیتی زەوی بەهەشت بکەن !



پیاوێک لە نیشتەجێیانی بەهەشت داوای ڕێگەدان لە خوای گەورە دەکات تا کشتوکاڵ بکات لەناو بەهەشتدا خوای گەورە پێی دەفەرمووێت : ئایا هەر شتێک ئارەزووت لێبێ لەبەردەستدا نیە ؟ ئەویش دەڵێ : بەڵێ ، بەڵام من حەزدەکەم کشتوکاڵ بچێنم ، ئینجا ڕێگەی پێ دەدرێت و ئەویش خێرا تۆوی خۆی دەچێنێت لەیەک چاوتروکانێکدا دەڕوێت و بەرزدەبێتەوە و دەیدورێتەوە و مەڵۆی دەکات و بەوێنەی چیاکان بەرزدەبێتەوە ، خوای گەورەش دەفەرمووێت : ئەی نەوەی ئادەم ئەوەتا بگرە تۆ بەهیچ شتێک تێر نابیت .... ))

**تێبینی** / ئەبێ ئەو ناو بەهەشتانە چەندێ پێشکەوتوو بن کە دارو درەختەکانی لە ئاڵتوون و زیو بن و بەروبوومەکانی هێندەی کوپەڵەی گەورە گەورەو بەران بێت وە هێشووە ترێیەکانی هێندەی ماوەی فڕینی قەلە ڕەشێک بێت ... هتد ئەبێ چ سروشتێکی ناوازەو خۆش و پڕ لە چێژ هەر لە دارودرەخت و سەوزایی و میوەو خۆراک و دەریاو زەریاکان و ڕووبارەکان و چیاو شاخەکان لەو بەهەشتانەدا بەدیهێنرابن کە چاوەکان لەئاستیانا کوێرن و دڵەکان بێ هەستن و گوێیەکان نابیستان لە وەسفیاندا

یاڕەبی بێ بەشمان نەکەیت لە فیردەوسی اعلا



تۆش کە نوێژ ناکەیت هەر لە ئێستاوە هەموو ئەم نیعمەتانەت لەدەست خۆت داوە ، تۆ کە شوێن عەقڵی مولحید و عەلمانی و چەپ و بێدینەکان کەوتوویت دۆڕاوی دونیاو قیامەت بوویت لەم بەهەشتانە بێ بەش بوویت ( الا من رحم ربي )

وێنەکە ئەم دونیایەیە کە هێندەی باڵە مێشولەیەک قیمەتی نیە لای پەروەردگار ئەی ئەبێ بەهەشت چەندێ دڵڕفێن و پێشکەوتوو ناوازەو جوان بێت کە پەروەرێن خۆی هێناویەتە بوون بەعیلمی ناکۆتای خۆی !!!؟



## لەم بەشەیا دڵتان ئەفڕێنم !

لەبەشی پێشوودا بە وردەکاری باخ و باخات و بێستانەکانی ناو نیشتیمانەکانی بەهەشت باسکرا کە چەند بە ڕازاوەیی و ناوازەیی و پڕ لە میوەو خۆراکی بەتام و بەلەزەتە و پەروەردگار ئامادەی کردووە بۆ بەندە باوەڕدارەکانی خۆی ... ئەی ئایا لەناو ئەو نیشتیمانانەدا ئاژەڵ و باڵندەو دروستکراوی تر هەن ؟!

لەناو بەهەشتدا پەروەردگار ئاژەڵ و ئەسپ و وشتری تیا دروستکردووە ....

پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام کرد ئایا لەناو بەهەشتدا ئەسپ هەیە ؟ پێغەمبەر فەرمووی : (( گەر خوای گەورە تۆ بکاتە ناو بەهەشتەوە چۆن ویستت لێبێ لەسەر پشتی ئەسپێک لە یاقوتی سور لەناو بەهەشتدا هەڵتدەگرێت بۆ ئەو جێگەیەی کە خۆت پێت خۆشە ))

وە پرسیاری لێکرد ئەی وشتر هەیە لەناو بەهەشتدا ؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی : (( گەر خوای گەورە تۆ بخاتە ناو بەهەشتەوە ئەوەی چاو و دڵت پێی خۆشە بۆ تۆ دەبێت و هەمووی بەدڵی خۆت دەبێت ))

**تێبینی**/دیقەت بدەن و تەدەبور بکەن کە پێغەمبەری خوا دەفەرموویت ئەسپێک لە یاقوتی سور ، ( بۆچی ئەسپ لە یاقوتی سور ؟ ) خۆ



ئەسپ ڕۆح لەبەرەو لە گۆشت و خوێن و ئێسقانە ! ، ئەتوانین لەمەوە تێبگەین کە لەو سەردەمەدا ئەساليبی هاتوو چۆ بريتی بووە لە ئەسپ و حوشتر نەک بەزمانی ئەمڕۆ ئۆتۆمبێل و فڕۆکە بێت ! پێغەمبەری خوا بۆئەوەی بەزمانی ئەو سەردەمەی خۆی

ئەو پیاوە تێبگەیەنێت ناوی ئەسپی هێناوە کە دروستکراوە لە یاقوتی سور یان هەر جۆرێک بێت کە ئەو پیاوە بیەوێ و ویستی لێبێ و حەزی لێ بێت بۆی سازو ئامادەدەکرێ و پێی دەبەخشرێ ئیتر ئۆتۆمبێل بێت یاخود فڕۆکە ... هتد یاخود دروستکراوی نایابی ترە کە هۆکاری هاتووچۆو گواستنەوەیە لەناو بەهەشتدا کە ئەتوانین بۆ تێگەیشتن ناوی بنێین ئەسپ یان ئۆتۆمبێل و فڕۆکە یان هەر دروستکراوێک بێت کە بۆ هاتووچۆ شیاوبێت وە لە یاقوتی سور دروستکرابێت و بەوجۆرو ڕەنگە بێت کە ئارەزووی بکەین چاو و دڵمان پێی خۆش بێت

لەبەهەشتی مەئوادا چەندەها باڵندەی سەوز هەن کە ڕۆحی شەهیدەکان پیایدا بەرز دەبێتەوە ، واتە پێش هاتنی قیامەت کاتێک یەکێک شەهید دەبێت ڕۆحەکانیان دەکرێتە ناو لەشی ئەو باڵندەیەوە ( ئەکرێ فڕۆکەی سەوز بێت تایبەت بە بەهەشتی مەئوا) ڕۆحی شەهیدەکان ڕێزیان لێ دەگیرێ و لای دارودرەختەکانی بەهەشتی گەورەوە بەرزدەکرێتەوە لەکاتێکدا لاشەکانیان لەناو زەویدایە



## ئایا ئەو کۆشك و چادر و ڤێلا و باڵەخانانەی ناو بەهەشت چۆنن؟ ئایا لەچی دروستکراون؟



خودی بەهەشت دروستکراوە لە خشتی ئاڵتوون و زیوی تێکەڵ کراو بە میسک

خانووەکانی بەهەشت خشتێکی لە ئاڵتوونە و خشتێکی لە زیوە و گیراوەکەشی لە میسکە وە چەو و بەردەکەشی گەوهەر و مرواریە و خۆڵەکەشی زەعفەرانە

وە هەندێ لە کۆشکەکانی بەهەشت لە ئاڵتوونی تەواو دروستکراوە وە لەو کۆشکانە کۆشکی پێشەوای مسوڵمانان عومەری کوڕی خەتابە خوای گەورە لێی ڕازی بێت کە کۆشکێکی چوارگۆشەی بەرزی ئاڵتوونیە

قوبەی (گۆمەزی) کۆشکەکان لەناو بەهەشتدا هەمووی گەوهەرو مرواریە خۆڵەکەشی میسکە ... وە هەندی لەو کۆشکانە لەبەردی مرواری دروستکراون بناغەو سەقفەکەی سەوزو سورو زەردە .

بەهەشتی کاتێک دەچێتە بەهەشتەوە و دەگاتە جێگاکەی خۆی یەکەمجار تەماشای بناغەی کۆشکەکەی دەکات تا بزانێت لەچی دروستکراوە تەماشادەکات (کۆشکی سەرەوەی) سەقفەکەی سەوزو زەردو سورە وە لەهەموو ڕەنگێکە ، پاشان سەری بەرزدەکاتەوە سەیری سەقفەکەی دەکات تیشکەکەی وەکو بروسکە وایە (هێندە ڕوناکە) گەر قەدەری خوا نەبووایە لەوەبوو نابینای کردایە

نیشتەجێبووانی ئەو کۆشکانە بەخۆشی تیایدا هەتا هەتایە دەمێننەوە بەبێ ترس ... ئەو ژوورو تەلارانە لەسەریان ژووری تر هەیە واتە قات قات لەسەر یەکن و باڵەخانەی بەرزیان هەیە بەجۆرێکە لەدەرەوە ناوەوەی دەبینرێت و لەناوەوە دەرەوەی دیارە ... ئەو ژوورو باڵەخانانە لە مرواری سپی و یاقوتی سورو بەردێکی تەنکی سەوز دروستکراون کە نە شکاوی تیایە نەدرزی تیایە ، هەر لەناو ئەو ژوورو تەلارانەدا ڕووبارو تاڤگەو باخ و میوەی تیایە وە هاوسەرو خزمەتکاری تیا نیشتەجێیە

لەناو بەهەشتدا بڕوادار چادرگەیەکی هەیە کە لەمرواری ناوبۆش دروستکراوە درێژیەکەی و پانیەکەی واتە (ڕووبەرەکەی) ( ٦٠ میلە ) واتە ٩٦,٥ کیلۆمەترە ، وە لەهەر ژوورو لایەکیدا هاوسەر و حۆریەکانی تێدایە بڕوادار بەسەریاندا دەگەڕێت و کەسیان کەسانی تر نابینن

٩٦.٥ کم واتە (واتە هەر چادرگەیەک مەوداکەی لە شاری هەولێرەوە تا شاری کەرکوکە)

ئەو چادرانە سەقف و دەرگاو کلیلەکانی هەمووی لەگەوهەری ناوبۆشە

بەهەشتیەکە دەبینێت ( دەرگاوانی کۆشکەکەی لە پێشیەوە دەڕوات تاکو دەرگای کۆشکەکەی بۆ دەکاتەوە ... ئەویش سەیردەکات سەقف و دەرگاو داخەرو کلیلەکانی هەموو لە گەوهەری ناوبۆش دروستکراون گەوهەرێکی سەوزی گەورە دەبینێت ( واتە کۆشکێکە ) دەرەوەی سەوزە بەڵام ناوەوەی سورە ٧٠ دەرگای تیایە و



هەموو دەرگایەک بەرەو کۆشکێکی گەوهەری ناو سەوز دەڕوات (واتە چەندین کۆشک و قەسرو ڤێلا هەموو بەیەکەوە دەرگاکانیان لەناو یەکدان ) ، وە هەموو یەکێک لەو کۆشکە گەوهەریانە بەرەو کۆشکی گەوهەری ڕەنگ جۆراجۆر دەڕوات ، وە لەهەموو کۆشکێکی گەوهەردا کورسی و قەنەفەو قەرەوێڵە هاوسەرو خزمەتکاری تایبەتی خۆی تێدایە

پەروەردگار بەنسیبمان بکەیت و بێ بەشمان نەکەیت لەو مەملەکەت و نیشتیمانانەی ناو بەهەشت

وێنەکان/ ئەو چادرگانەن کە مرۆڤەکان دروستیان کردووە وە لەناوییاندا چەند ڤێلایەکی کەم هەیە ، ئەی ئەبێت چادرگەکانی بەهەشت چ جوان و ناوازەو سەرنج ڕاکێش بن کە پەروەرێن بەزاتی گەورەیی خۆی هێناونیەتە بوون وڕووبەرەکەی هێندەی مەودای شاری هەولێر بۆ شاری کەرکوکە





## هیچ ناڵێم خۆتان بیخوێننەوە و پاشان تەماشایەکی وێنەکانیش بکەن !

بەردەوامین لە وەسف و سەنای کۆشک و ڤێلاو چادرگە گەورەکانی ناو بەهەشت کە ڕووبارەکان بەژێریاندا دەڕوات ئەم کۆشک و ڤێلاو چادرگانە لە مرواری و یاقوتی ڕەنگاو ڕەنگ دروستکراون کە تیشک دەدەنەوە ، بەجۆرێکە کە گەورەیی ئەو چادرگانەی ناو بەهەشت مەوداکەی ٩٦.٥ کیلۆمەترە واتە هێندەی نێوان شاری هەولێر بۆ کەرکوکە هەروەها چەندەها کۆشک و نهۆم لەناو ئەو چادرگانە دروستکراون و هەموویان دەرگاکانیان لەناو یەکدا بۆیەک دەکرێتەوە و لەناو باخ و باخاتی پڕ لەمیوەو گوڵ و ڕێحانەی ڕازاوەدان ... هتد

جبرەیل علیه سلام بە پێغەمبەری خوای فەرموو علیه الصلاة والسلام ئەوە خەدیجەیەو سەلامی خوای پێ ڕابگەیەنە ( واتە خوای گەورە سەلام لە خەدیجە دەکات ) وە فەرمانی کرد مژدەی پێ بدات بەکۆشکێک لەبەهەشتدا لە مرواری و گەوهەر دروست کراوە و دەنگە دەنگ و ماندووبوونی تێدانیە

تێبینی/بەڕاستی ئەو کۆشک و تەلارانەی ناو بەهەشت جێی ئارامی و حەوانەوەن کە دەنگە دەنگ و هاژووهوژو سەوتی بێزارکەری تیانیە نیعمەت پێدراوەکانی ناوی لەوپەڕی خۆشی و نەفس ڕەحەتیدان ، واتە وەک بیناکانی دونیا نین کە دەنگی سەیارەو وەڕینی سەگ و تەقەتەقی کارگەو مەحەلەکان هەبێ و مرۆڤەکان بێزار بکات

بەڵکو ئارامترین شوێنی حەوانەوەن ، ئەو خوا پێداوانە لە خۆشترین جێگەدا دەژین هەرکاتێک ویستیان لێبێ گوێ لە خۆشترین دەنگ دەگرن کە دەنگی خۆشی حۆریەکانە بە ژنان و پیاوانەوە ...

هەروەها ئاسیای خێزانی فیرعەون خوای گەورە کۆشکێکی بەویش بەخشیوە کاتێک داوای کرد لە خوای گەورە ڕزگاری بکات لە (فیرعەون و کردەوەکانی) وە خانوویەکی بداتێ لەبەهەشتدا ، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە فیرعەونی طاغوت چوار ٤ مێخەکی بەهەردوو دەست و قاچی ئاسیای خێزانیدا داکوتی وە کاتێک فیرعەون و دارو دەستەکەی دوورکەوتنەوە و بەوحاڵەوە جێیان هێشت ، ئینجا فریشتەکان دەهاتن سێبەریان دەکرد بەسەریەوە ئینجا ئەویش لەوکاتەدا ئەو دوعایەی کرد هەتا لەوێدا خوای گەورە کۆشکەکەی لەبەهەشتدا پێ نیشاندا

ئایا دەبێت لەناو هەر یەکێک لەو کۆشک و ڤێلاو تەلارو باڵەخانانە چی تێداپێت لەکەل و پەل و پیداویستی ؟

ئەبێ لە چ توخمێک دروستکرابن ؟ ئەبێ چەند ڕازاوەو نەخشین بن ؟ ئەبێ چەند پێشکەوتووبن لەڕووی تەکنەلۆژیای ئیلاهی ناو بەهەشتەوە ؟



## ناوماڵی ناو کۆشکەکانی بەهەشت



لەناوبەهەشتدا ڕاخەرو فەرشی بەرز هەن بەجۆرێکە فەرشەکان هەمووی لە ئاوریشم دروستکراون ئەو بەختەوەرانەی ناو بەهەشت لەسەر ئەو جۆرە فەرش و ڕاخەرانە پاڵیان داوەتەوە کە بەرەکانیان لە قەیفەو ئاوریشمە وە میوە لێکردنەوەی باخەکانیان ئاسانەو نزیکە لەدەستیان

ناوەوەی فەرشەکان ئاوریشم بێت ئەی دەبێ دەرەوەی فەرشەکان چۆن بێت ؟ بەس پەروەردگار خۆی دەزانێ چ سەرنج ڕاکێش و ناوازەن

لەناو ژوورو کۆشکەکانی بەهەشتیەکاندا جێی پاڵکەوتنی بەرز هەیە وەک خوای گەورە دەفەرموویێت { فیها سرر مرفوعة } واتە سیسەمی بەرز (شوێنی پاڵدانەوە) ی تێدایە بۆئەوەی بەچاوی خۆی لەسەر ئەو سیسەمانەوە هەموو موڵک و مەملەکەتەکانی ببینێت ( بەهۆی بەرزی و پێشکەوتووی کۆشک و ڤێلاو باڵەخانەکانیەوە )

ئەو بەختەوەرانە پاڵیان داوەتەوە لەسەر چەندین سیسەمی ڕیزکراوی ڕازێنراوی بەرامبەر بەیەک وە پەروەرێن (حور العین) دەکاتە هاوسەریان

وە پشتی و سەرین و فەرشی ژوورەکان و کۆشکەکانیان بەڕیز لەهەموو لایەکدا ڕاخراوەو ئامادەکراوەو داندراوە بۆیان ، وە لەتەختایی بەهەشتدا (واتە سەر زەوی ناو بیناکان ) ڕاخەری ناو خوری و  نایاب ڕاخراوەو بڵاوبۆتەوە



## خزمەتگوزار و خزمەتکارانی ناو نیشتمانەکانی بەهەشت



لەناو ئەو مەملەکەت و کۆشک و تەلارو باڵەخانانەدا گەنجانی خزمەتگوزار هەن خزمەتی بەهەشتیەکان دەکەن

ئەم خزمەتکارە لاوانە قەت پیرنابن و نامرن و هەتاهەتایە دەمێننەوە

ئەو گەنجە خزمەتکارانەی ئەوێ هێندە جوان و ڕازوەن هێندە ڕوخساریان جوانە دەڵێی مرواری ساف و پاک وان کە هیچ شتێکیان بەرنەکەوتبێت هەموو سپی و جوانن ...

ئەو مێردمنداڵ (گەنج و لاوانە ) سەرقاڵن بە خزمەتکردن و بەدەوری بەهەشتیەکاندا دەسوڕێنەوە لەسەر فەرشی ئاوریشم و ئاڵتوون دێن و دەچن وەکو مرواری وان ، ئەو لاوانە هێندە زۆرن لە ژمارە نایەن

ئەو کەسەی کە لەنزمترین پلەی بەهەشتدایە هەزار خزمەتکار دێن و دەچن لەخزمەتکردنیدا ، وە هەر خزمەتکارێک کارێکی تایبەت بەڕێوە دەبات جیاوازە لەکاری هاوڕێکانی تری ...

ئەو خزمەتکارە لاو و گەنجانە خوای گەورە دروستی کردوون لەبەهەشتدا بۆ خزمەتکردنی نیشتەجێ بووەکانی ، ئەوانە مندالانی بێ باوەڕەکانی دونیان کە بەمنداڵی مردوون خوای گەورە کردوونیەتە خزمەتکارانی خەڵکانی ناو بەهەشت

**تێبینی/** پەروەردگار ڕێزی گەورەی ناوە لەو لاو و گەنجە خزمەتکارانە کە لەناو بەهەشتدا خزمەتی بەهەشتیەکان دەکەن چونکە لەناو بەهەشتەکاندا ماندووبوون و هیلاک بوون نیە بەڵکو بگرە ئەوانە بە خزمەتەکانیان بۆ باوەڕدارانی بەهەشت زۆر دڵخۆشن پلەیەکی گەورەیە کە پێیان بەخشراوە

تێبینی بکەن هەر لە دنیادا هەمیشە هۆتێل و ڕێستۆرانتە گەورەو زەخمەکان لەهەوڵی ئەوەدان کە خزمەتکارانی لاو و گەنج دابین بکەن بۆ خزمەتکردن و کارکردن تیایاندا وە هەمیشە ئەوانە هەلی دەستکەوتنی کاریان لەو شوێنانەدا زۆرترە کە ڕوخسار جوان و کەشخەو مورەتب و جل و پۆشاک جوانن و شیک پۆشن ... هتد

بۆیە پەروەردگار لەبەهەشتدا بۆ باوەڕداران و بەختەوەرانی ناو کۆشک و ڤێلاکانیان خزمەتکارانی لاو و گەنجی دابین کردووە کە هەموو ڕوخسار جوانن وەک مرواری وان کە بەدەوروبەریاندا دێن و دەچن و خزمەت دەکەن بەبینینیان دڵەکان دەکرێنەوە و هەرگیز نیشتەجێبووانی ناوی بێتاقەت نابن

## پێداویستیەکان لەناو مەتبەخەکانی کۆشکەکانی بەهەشت



قاپ و قاچاخی ناو بەهەشت دوو جۆرن جۆرێکیان لە ئاڵتوونی پاک دروستکراون و جۆرەکەی تریان لە زیون ... واتە دوو بەهەشتیان خشڵ و قاپ و پۆشاکەکانیان و پێداویستیەکانیان لە ئاڵتوونە ، وە دوو بەهەشتیان خشڵ و قاپ و پێداویستی و پۆشاکەکانیان لە زیوە ...

وە لەناو بەهەشتدا سینی و قاپ و دەفرو دەوری لێیەو هەموویان لە ئاڵتوون و زیو دروستکراون بەجۆرێک کوپی زیوی هەیە کە لەناوەوەی دەرەوە دەبینرێ ...

ئەو بەهەشتیانە گەنجان و لاوانی ئێسک سوکی خزمەتکارانیان جۆرەها شەربەت و شەرابیان لە سوراحی و دۆلکەی زیودا بۆ دەگێڕن پێشکەشیان دەکەن کە پەرداخەکانی لە زیو شوشەو کریستاڵی تایبەت دروستکراون هەریەکەی بەئەندازەو قەبارەی جیاجیا دروستکراون بەگوێرەو ویستی کەسانی ناو بەهەشت

شەراب و شەربەتەکانیان لە سەرچاوەیەکی ڕەوانەوە لە کوپ و سوراحی زیو و ئاڵتوونیدا بۆیان دەبەن و پێشکەشیان دەکەن

**تێبینی/** شەرابی ناو بەهەشت وەک شەرابی دونیا نیە بەڵکو پاکەو مرۆڤەکان بەخواردنەوەی ئەو شەرابە بەتام و بەچێژانەی ناو بەهەشت عەقڵ و هۆشیان لەدەست نادەن

وێنەکان ناو بەهەشت نیە لێتان تێک نەچێ ئەوە هی دونیایە کە مرۆڤەکان سازیان کردووە ، ئەی ئەبێ دیمەنەکانی ناو کۆشک و ڤێلاکانی بەهەشت چۆن بن کە پەروەردگار خۆی هێناونیەتە بوون و ڕازاندوونیەتەوە !!!



## ئەبێ خواردەمەنیەکانی ناو بەهەشت چۆن بن لەڕووی تام و بۆنخۆشی و سەرنج ڕاکێشیەوە !

ناتوانرێ وەسفکرێ چونکە تامم نەکردووە !!

ئێستا واتان لێ ئەکەم یەکسەر ڕابکەن بۆلای سەلاجەکە

بەس مادام پەروەردگار وەسفی بکات ئەوە ئەوەندە کافیە کە هیچ خۆراک و میوەیەک و گۆشتی باڵندەو گای برژاو و هەنگوێنێکی ئێرەی ناگاتێ

لەگەڵما بەردەوام بن و خوێنەربن بزانین خۆراکە بەتامەکانی ناو بەهەشت چین و چۆنن

پەروەردگار دەفەرمووێ { ولكم فيها فاكهة كثيرة منها تاكلون}
واتە لەبەهەشتدا میوەی ئێجگار زۆرتان دەبێت و لێی دەخۆن

میوەی وەهای تیایە کە تەنها لەناودا لەوانەی دونیا دەچێت ئەگینا لەڕووی تام و بۆن و پێکهاتەوە زۆر جیاوازە لەوانەی کە لەدونیادا هەیە بەجۆرێکە کە نەبڕاوەیەو ناوکیان تێدانیە

میوەو خواردەمەنی وەهای تیایە کە لەسەر ئەم زەوییەی ئێستامان بوونی نیە بەژمارەیەکی ئێجگار زۆر

پەروەردگار دەفەرمووێت { وامددنهم بفكهة ولحم مما يشتهون}
واتە جۆرەها گۆشت و میوەیان هەیە لەوانەی خۆیان ئارەزوویان لێ بێت

وەهەروەها دەفەرموویّت { كلوا واشربوا هنيئا بما كنتم تعملون}
واتە بخۆن و بخۆنەوە و بنۆشن لەپاداشتی کارە چاکەکانتان

تۆ مادام کەسێکی تەنها خودا پەرست بوویت و الله تعالی ت
لە پێگەو مەقامی خۆیدا ناسی وە خۆت نەدۆڕاند بۆ هیچ بەرنامەو
گروپ و ئەفکارێک لەغەیری دینی ئیسلامی خوای گەورەو وە
لەپاڵ پەروەردگاردا هاناو هاوارت بۆ هیچ کەس و گروپ و شتێک
نەبرد ، وە بەردەوام بوویت لە چاکەکاری بەئیمانەوە ئەوا مژدەت
لێبێ کە هەموو ئەم نیعمەتانەی ناو نیشتیمانەکانی بەهەشتەکانت
پێ دەبەخشرێت

خەڵکانی ناو بەهەشت لەهەموو جۆرە میوەیەکی ئێجگار بەتام
و بەلەزەتی ناو بەهەشت دەخۆن و وە لە هەموو جۆرە گۆشتێکی
بەتام دەخۆن بەتایبەت زیادەی جگەری نەهەنگ لەگەڵ گۆشتی
گای ناو بەهەشت و باڵندەی بەهەشت

پەروەردگار دەفەرموویّت { وفكهة مما يتخيرون * ولحم طير
مما يشتهون } هەر میوەیەک خۆیان هەڵیبژێرن دێتە بەردەستیان
و دەیخۆن ، وە هەر گۆشتێکیش خۆیان ئارەزوومەندی بن دێتە
بەردەستیان و نۆشی دەکەن

گۆشتی باڵندەی ناو بەهەشت بەبرژاوی و سورەکراوی و بە
وشکی ... هتد

باڵندەکانی ناو بەهەشت زۆر گەورەن و بەهێندەی وشترێک دەبن
لەسەر درەختەکان دەنیشنەوە و لە درەختەکانی بەهەشت دەخۆن



هەروەها لەناو ئاوی کەوسەردا باڵندە هەیە ملی بەقەدەر ملی وشترێک دەبێت و ئیمامی عمر فەرمووی ئا ئەوانە زۆر بەختەوەرن ، پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرمووی ئەوەی گۆشتی ئەو باڵندەیە دەخوات زۆر بەختەوەرترو خۆشحاڵترە

لەناو بەهەشتدا ئەگەر هەر بەهەشتیەک حەزی لە گۆشتی باڵندەیەک بێت بانگی دەکات و ئەویش دێت و دەکەوێتە سەر سفرەکەی، بەهەشتیەکەش لەلایەکی باڵندەکە دەخوات بەوشکی وەلایەکەی تری بەبرژاوی پاشان باڵندەکە وەکو یەکەم جاری لێ دێتەوەو دەفڕێت

پیاوێکی بەهەشتی ئەگەر حەز لە گۆشتی باڵندەیەک بکات لە باڵندەکانی ناو بەهەشت ، خێرا دێتە ناو دەستیەوە بەپاککراوی و برژاوی

تۆ ان شاءالله ئەگەر خوای گەورە بەهەشتت بەنسیب بکات ئەوا توانای ١٠٠ کەست دەدرێتێ لە توانای خواردن و خواردنەوە





**تێبینی/** لەپێش چوونە بەهەشت لاشەی مرۆڤەکان هەمووی گۆڕان لە ڕووی فیزیۆلۆجی و ئەناتۆمیەوە بەوهۆیەوە ئەو توانا گەورەیە درا بە بەهەشتیەکان

لەناو نیشتیمان و مەملەکەتەکانی بەهەشتدا بەهەشتیەکان دەخۆن و دەخۆنەوە بەبێ ئەوەی میزو پیسایی و تف و بەڵغەمیان هەبێت و فرێی بدەن بەڵکو لەبری ئەوانە پەروەردگار دەیگۆڕێت (لاشەکان وەک هی ئێستامان نیە ) بۆیە لەبری ئەوە (سبحان الله و الحمدلله) دەڵێن وەک هەناسەدان ، خواردنەکانیان دەنگی تێربوونی بەدوادا هەیەو بۆنەکەی بۆنی میسکە

واتە تۆ دەخۆیت و دەخۆیتەوە لە گۆشت و میوەکانی ناو بەهەشت تا تێردەبیت و پاشان هەناسەو بۆنی خۆراکەکان وەک بۆنی میسکەو

(سبحان الله و الله اكبر و الحمدلله ) بۆ ئەرک دەڵێن وەک چۆن ئێستا هەناسە دەدەیت بەبێ ئەرک

تۆ لەناو بەهەشتدا میزو پاشەڕۆت نیەو دەبێت بە عەرەق و دەتکێت لە پێستت (وەک عەتری خەستی بۆنخۆش) ی میسک ناوسکت بەتاڵ دەکاتەوە

خەڵکانی ناو بەهەشت ماندوو نابن لە ئامادەکردنی سفرەو خوانەکانیان لەناو بەهەشتدا بەڵکو خزمەتکارەکان بۆیان ئامادە دەکەن لەناو قاپ و پێداویستی ئاڵتوونیدا ( سورەتی الزخرف ٧١)

خواردنی بەهەشت هەمیشەییەو نەبڕاوەیە و خەڵکانی بەهەشت دڵخۆشن بەو خواردنەیان و چێژی لێ دەبینن ، وە باشترین کاتی خواردنی بەهەشتیەکان کاتی بەیانیان و ئێوارانە

سورەتی مریم ئایەتی ٦٢

## شەرابە بەتام و
## بەلەزەتەکانی بەهەشت



پەروەردگار شەرابی پاک دەداتە بەهەشتیەکان (واتە شەرابێکی بەتام و بەلەزەت و بەهۆشیەوە بەهەشتیەکان عەقڵیان لەدەست نادەن)

شەرابی بەهەشت وەک شەرابی دونیا نیە کە کەسەکە بکات بەعەرەبانەی سێ تایی و بەشێوەی ڕەقەم ٤ ڕێ بکات و بڕوات !

ئەو شەرابانە کە بەهەشتیەکان دەیخۆنەوە پێی نارشێنەوەو نارەحەتیان ناکات و سەریشیان پێی ناهێشێت و سەرخۆشیشیان ناکات .

ئەو شەرابانەی ئەوێ وەک هی دونیا نین و تێک ناچن و مرۆڤەکان تێک نادەن و عەقڵیان لەدەست ناچێت تا قسەی پڕوپوچ بکەن و تاوان بکەن .

وە جاری واهەیە ئەو شەرابە بەتامە کافوری تێکەڵ دەکرێت کە زۆر ساردەو بۆنێکی خۆشی هەیە ، وە هەندێ جاریش بۆیان تێکەڵ دەکرێت لەگەڵ زەنجەبیل کە گەرم و بۆنخۆشە . ئەمە تەنها بۆ (اصحاب اليمين)..ە بەڵام غەیری ئەوان و (المقربون) بێ تێکەڵ کردن دەیخۆنەوە ، وە ناوی ئەو سەرچاوەیەی کە تێکەڵ بەو شەرابە دەکرێت ناوی تەسنیمە



تێبینی/اصحاب الیمین ئەو بەهەشتیە پلە بەرزانەن کە لای دەرگاکانی لای ڕاستی بەهەشتەوە چوونەتە ژوورەوە و ئەو پلەیەیان بەدەست هێناوە والله اعلم

وە دوا شەرابیان تێکەڵ بە میسکی پوخت و ڕووت دەکرێت وەک پەروەردگار دەفەرموویێت ئەو چاکە خوازانە ئاو و شەرابێکیان دەدرێتێ کە دوورە لە غەش و تێکەڵە بەمیسک .... کە ئەمە شەرابێکی سپیە وەک زیو کۆتایی شەرابەکەیانی پێ دێنن ، ئەگەر کەسێکی خەڵکی دونیا دەستی تێبخات هیچ ڕۆح لەبەرێک نامێنێ لەسەر زەویدا کە بۆنی نەکات

ئەم شەرابە پاک و بەلەزەتانە نسیبی ئەو باوەڕدارانە دەبێت کە لە دونیادا شەرابیان نەخواردۆتەوە ، پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام دەفەرمووێ هەرکەسێ پێی خۆشە خوای گەورە لە شەرابی ڕۆژی دوایی بێ بەشی نەکات با لە دونیا وازی لێ بێنێت ، هەرکەسێک لە دونیادا مەی بخواتەوەو پاشان بچێتە بەهەشت بەپاداشتی چاکەکانی ئەوا لەبەهەشتدا شەراب ناخواتەوە ئەگەر بێتو تەوبە نەکات لەسەری و وە لەسەر ئەو کارە مردبێت

لەناو بەهەشتدا ئاوی شیرین هەیە یەکێک لە کەسەکانی ناوبەهەشت ئەگەر ئارەزووی یەکێک لەشەرابەکانی بەهەشت بکات ئەوکات سوراحی و پەرداخەکە دێتە ناودەستی لێی نۆش دەکات و پاشان دەگەڕێتەوە جێگەی خۆی ئەو شەرابەش کە دەیخۆنەوە هیچ ماندووبوون و بێ تاقەتی پێوە نابینن وە ئاویش باشترین خواردنەوەیان دەبێت چونکە سەروەری خواردنەوەکان لە دونیاو دوارۆژدا بریتیە لەئاو

**تێبینی/** ئەبێ پێداویستیەکانی ناو ئەو قەسرو کۆشک و باڵەخانانەی بەهەشت چەندێ پێشکەوتووبن لەڕووی تەکنەلۆژیای ئیلاهیەوە کە وا تەنها بە ئارەزوو لێبوون خۆیان بێنە ناو دەستەکانت و لێی بنۆشی و پاشان بچنەوە شوێنی خۆیان پێشکەوتوویيان بەشێوەیەکە بەستراوەتەوە بەبەشی (سێرێبلیەمی مێشکەوە).

پەروەردگار دەفەرمووێت لە سورەتی محمد ئایەتی ١٥ {وێنەی ئەو بەهەشتەی کە خوای گەورە بڕیاری داوە بدرێت بە پارێزکاران ئەمەیە : چەندەها ڕووباری ئاوی تێدایە کە بەردەوام لەسەری دەڕوات و سازگارن و بۆن و تامی نەگۆڕاوە }

پەروەردگارا بەگەورەیی خۆت لەم نیعمەتانەی ناو بەهەشتەکەت بێ بەشمان نەکەیت





## حۆریە ناسك و نازدارو جوان و دەنگخۆشەکان

حۆریە ناسک و نازدارو جوان و دەنگخۆشەکانی ناو قەسرو ڤێلاکانی نیشتمانەکانی بەهەشت

لەو بەهەشتە جوان و دڵڕفێنەدا تۆ خەم مەخۆ چونکە سینگڵ نابی بەڵکو پەروەردگار حۆری چاوگەش و سینە بەرزو لەش و لار جوان و ڕێک و پێک و دەنگخۆش دەکاتە هاوسەرت

هیچ خەمت نەبێ یەک دانەو دوان نابێت بەڵکو لە ژمارەدا هاوسەری حۆری ناسک و نازداری زۆرت پێ دەبەخشرێ

وە دڵنیاشبە کە بەشی پێویستی هەموویان دەکەیت بەزیادەوە چونکە توانای ١٠٠ سەد پیاوت دەدرێتێ کە بتوانی خۆشی و چێژ لەهەموویان ببینی هەریەکەیان لە قەسرو ڤێلای خۆیدا و ئەوانیش دڵخۆش بکەیت

وشەی حۆری یان ناونان و وەسفکردنی هاوسەرە قەشەنگ و جوانەکانی ناو کۆشکەکانی بەهەشت بە حۆری واتە سەرسوڕهێنەر ، بەمانایەکی تر واتە هێندە جوان و دەنگخۆش و ناسکن و پۆشاکەکانیان هێندە پاک و ڕەنگ جوانن پیاو توشی سەرسوڕمان دەکەن  چاوەکان توشی سەرسوڕمان دەبن

حۆری ناوە بۆ ئەو ئافرەتەی کە سپێنەی چاوی زۆر سپیەو ڕەشی گلێنەی چاوی زۆر ڕەشە

حۆریە نازدارەکان زۆر پاکن بەجۆرێک کە دوورن لە خوێنی سوڕی مانگانەو خوێنی پاش منداڵبوون و دوورن لە میزو پاشەڕۆو تف و بەڵغەم و هەموو پیسیەک کە لە ئافرەتانی دونیادا هەیە .

حۆریەکان پاککراونەتەوە لەهەرچی ڕەوشتی خراپ و سیفاتی نەشیاو هەیە وە زمانیشیان دوورە لە قسەی پڕوپوچ و بێ کەڵک وە پۆشاکەکانیشیان خاوێنە وە لەپیسی و لەکەداری و پەڵە پارێزراوە

بیهێنەرە پێش چاوی خۆت کە تۆ هاوسەرێکت پێ ببەخشرێ کە پاک و خاوێن بێت لەڕووی جەستەوەو وە لەڕووی مەعنەوییەوە زۆر زمان و ڕەوشت و هەڵسوکەوت نمونەیی بێت بەجۆرێک تەنها قسە خۆش و دەنگ خۆش و ناسک و جوان بن ... یا الله ئەوە چ نیعمەتێکە

جوانی ڕوخساری حۆریەکان بەشێوەیەکە کە ئافرەتی گەنجی جوانی سپی پێستی چاو بەڵەکی گەورە لەگەڵ تۆخی سپێنەی چاوی و ڕەشی گلێنەی چاوی ، پەروەردگار خۆی وەسفیان دەکات و دەفەرمووێت لە سورو سپێتی پێستیاندا وەکو سپێتی یاقوت و سورێتی مەرجانن هەروەها وەک ومرواری سپی پارێزراون

ئەو حۆریە نازدارانە هێندە نورانین ئەگەر بێت و یەکێکیان خۆی نیشانی خەڵکی سەر زەوی بدات نێوانی ئاسمان و زەوی ڕووناک دەکاتەوە

ئەو حۆریە ناسک و جوانانە هەریەکێکیان حەفتا پۆشاکی تەنکی ئاوریشمیان لەبەردایە وە مۆخی ناو ئێسکی قاچیان دیارە لە پشتی گۆشت و پۆشاکەکانیانەوە وەک چۆن شەرابی سور دیارە لەناو شوشەی سپیدا

چاوەکانی ئەو هاوسەرە قەشەنگانە تەنها دەڕوانێتە مێردی خۆیان و هەروەها نەفس و ڕۆح و بیریان هەر هەمووی تەنها لای مێردی خۆیانە واتە هەریەکێکیان چاوەکانی تەنها مێردەکەی خۆی پێ دەبینێت و هەموو بیرو هۆش و ڕۆح و عەقڵی تەنها لای مێردەکەی خۆیەتی وابەستەیە پێوەی

ئەو حۆری عەینانە لە خێمەکانی خۆیاندا نیشتەجێن و نایەنە دەرو تەنها مێردی خۆیان دەبینن واتە بەوشێوە تایبەتە پەروەردگار خەلقی کردوون بۆ پیاوانی بەهەشت

حۆریە ناسک و نازدارەکان هەموویان تەمەن گەنج و لاون و یەک تەمەنن کە ٣٣ ساڵن و هەموویان کچن بە کچێنی پەروەردگار دروستی کردوون وە هیچ کەس نەچۆتە لایان پێشتر نە لە مرۆڤ و نە لە جنۆکە

ئەو حۆریانە خوڕەوشت و هەڵس و کەوت و ڕوخساریان لەوپەڕی جوانیدایە ...

ئەگەر بێت و ئافرەتێکی بەهەشت خۆی نیشانی خەڵکانی سەر زەوی بدات نێوانی ئاسمان و زەوی ڕوناک دەکاتەوەو بۆن خۆشی دەکات

ئەو حۆریانە خشڵ و ئاڵتوونی هێندە جوانیان هەیە کە زۆر زیاتر قەشەنگ و ڕازاوەیان دەکات بەجۆرێکە هەریەکێک لەو حۆریانە تەنها سەرپۆشەکەی سەری چاکترە لە دونیاو لەوەشی کە تیایدایە

ئەبێ سەرپۆشی هەر یەکێک لەوانە چەند جوان و نەخشین بێت کە هەموو دونیاو ئەوانەی تیاشیەتی نەگات بە بەنرخی و جوانی تەنها ئەو سەرپۆشەی حۆریەکان !؟

لە ڕیوایەتێکی تردا پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام دەفەرموێ سەرپۆشی ئافرەتێکی بەهەشتی باشترە لە دوو ئەوەندەی دونیا

حۆریەکانی بەهەشت هەریەکەیان تاجیان لەسەردایە کە زۆر جوانترو بەنرخترە لە دونیاو لەوەشی کە لە دونیادا هەیە

ئەو حۆری عەینانە هەریەکەیان حەفتا پۆشاکی لەبەردایە کەمترینیان وەکو گوڵی سورە ( شقائق النعمان ) کە لەدرەختی (طوبا) یە ئەو کەسە مۆخی ئێسکی قاچی دەبینێت لەسەر ئەو حەفتا پۆشاکەوە ، وە تاجیان لەسەردایە کە بچوکترین مرواری تاجەکەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ڕوناک دەکاتەوە

ئەم حۆریە نازدارانە مێردەکانی خۆیانیان زۆر زۆر خۆش دەوێ و زۆر زۆر شەیدای مێردەکانیانن بەجۆرێک تۆ ئەگەر بەهەشتی بیت ئەوا هەر لە دونیادا ئەو پشتیوانیت لێ دەکات تا ئەوکاتەی لەبەهەشت پێی دەگەیت .. چۆن ؟

هەر ئافرەتێک ئازاری مێردەگەی بدات لە دونیادا ، هاوژینەکەی خۆی لە حۆریەکانی بەهەشت لەولاوە هەڵدەداتێ و دەڵێت :

ئازاری مەدە خوا بتکوژێت ئەوە ئەمانەتێکە لای تۆ ... نزیکە لێت جیابێتەوە و بگاتە لای ئێمە .

پیاوێک لە بەهەشت لەسەر جێگەکەی خۆی پاڵ دەداتەوە حەفتا ساڵ بێ ئەوەی جێگای بگۆڕێت ، پاشان ئافرەتێک دێت بۆلای و دەست دەخاتە سەر هەردوو شانی ، ئەویش سەیری ڕومەتی ئافرەتەکە دەکات خۆی دەبینێتەوە لە ڕومەتیدا چونکە ڕومەتی لەئاوێنە بێ گەردترە .... سەلامی لێ دەکات و ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دەداتەوە و پرسیاری لێ دەکات تۆ کێیت ؟ ئەویش دەڵێت : من لەو زیادەیەم کە خوای گەورە پێی بەخشیویت (( وە ئەو پیاوە مۆخی ناو ئێسکی قاچەکانی ئەو حۆریە دەبینێت گەرچی ٧٠ پۆشاکیشی لەبەردا بێت )) .

**تێبینی/** ئەبێ خۆشی نیعمەتەکانی بەهەشت بە چ شێوازێک بێت ئەبێ چ دڵخۆشیەک و دڵڕفێنیەک و سەرسوڕمانێک بێت کە ٧٠ ساڵ کات تێدەپەڕێ تۆ هەستت بە کاتەکە نەکردووە لە خۆشی وگەورەیی و چێژی یەکێک لەو بەخششانەی ناو ئەو بەهەشتە کە خوای گەورە پێی بەخشیوی ؟؟؟

هەر پیاوێکی بەهەشتی لەبەهەشتدا توانای ١٠٠ پیاوی دەدرێتێ لە خواردن و خواردنەوەو ئارەزوو و جووت بوون لەگەڵ ئافرەتاندا وە دەتوانێت لە ڕۆژێکدا لەگەڵ ١٠٠ کچدا جووت ببێت ، خەڵکانی ناو بەهەشت لە خۆشی و ئارەزووەکانیاندا کاتی خۆیان بەسەردەبەن ... بۆچی ؟

چونکە ئەویٚ ژیانی هەمیشەیی و پاداشتەو مردن و هەوڵدان و ڕاکە ڕاک و ئازارو نەخۆشی و ناخۆشی نیە بەڵکو ژیان تیایدا هەمیشەییە و ئەهلەکەی بەس لەخۆشی و نیعمەتدا دەژین

پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام لەبەهەشتدا جووتبوون هەیە ؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمووی بەڵێ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە جار لەدوای جار هەیەو هەر پاک دەبنەوەو دەبنەوە بە کچ

باسی حۆریە جوان و ناسک و چاوگەشەکان .... هێشتا ماویەتی چاوەڕێ بن

ئافرەتان گلەیی مەکەن لەبەشەکانی دواتردا باسی دەکەم کە ئێوە چ گۆڕانێک بەسەرتاندا دێت کە لە حۆریەکان جوانتر دەبن و دەبنە شاژن و گەورەی حۆریەکانی بەهەشت



## حۆریە ناسك و چاوبەڵەکەکانی بەهەشت لەسەر کەناراوەکانن و گۆرانیت بۆ دەڵێن

بیهێنە پێش چاوەکانی خۆت ئێستا فریشتەی ڕۆحکێشان دێت و ڕۆحەکەت بەخانەخانەی لەشتا دێنێتە دەرەوەو پەردە لەسەر چاوەکانت لادەچێت وە بەهۆی ئەوەی کەسێکی موتەقی و خواپەرست بوویت بەتەنها و لەگەڵ الله دا هاناو هاوارت بۆ هیچ کەس و شتێکی تر نەبرد و خۆت نەدایە پاڵ هیچ گروپ و بەرنامەو حزب و لایەنێک تەنها پیاوی بەرنامەی ئیسلامی خوای گەورەبوویت ئەوا لەناو گۆڕەکەتدا مەملەکەتەکانت و نیشتیمانەکانت و حۆریەکانت بەیانیان و ئێواران نیشان دەدرێت . تا دەگەیتە ڕۆژی قیامەت و هەڵدەسێنرێیتەوە

لەناو گۆڕەکەتدا و ئەگەر تۆ شەهید بووبیت لە پێناوی تەنها ڕێگەو بەرنامەو دینی ئیسلامی پەروەردگاردا ئەوا ئەو فەزڵ و گەورەییەت پێ دەدرێ کە هاوسەرەکانت لە حۆریەکان دێنە سەر لاشەکەت و ئامادەی جەنازەکەت دەبن لە ساتی شەهید بوونتداو پێشوازیت لێ دەکەن تۆش بەچاوی بێ سنوری ڕۆحەکەت تەماشای جوانی و قەشەنگیان دەکەیت .

**تێبینی/** ئامادەبوونی هاوسەری حۆری لەکاتی ڕۆح دەرچوونی پیاوی ئیمانداردا تەنها بۆ شەهیدە والله اعلم

پێغەمبەری خوا علیە الصلاة والسلام هاتە لای جەنازەی هاوەڵە دەشتەکیە کۆچکارەکە و دڵخۆش بوو وە پاشان پشتی تێکرد وە هۆکاری پشتێکردنەکەش ئەوەبوو کە فەرمووی { بۆیە ڕووم لە تەرمەکەی وەرگێڕا چونکە ئا ئێستا هاوسەرەکەی لە حور العین لای سەریەوەیەتی }

پێغەمبەری خوا بە شەهیدێکی تری فەرموو بینیم هاوسەرەکەی لە حور العین دەچووە سەر تەرمەکەی و خۆی نزیک دەکردەوە لە پۆشاک و جوبەکەی

لەمەوە تێدەگەین کە هاوسەرانی شەهید لە حۆریەکانی بەهەشت بەو هەموو جوانی و نازداری و قەشەنگیانەیانەوە هێندە تامەزرۆی گەیشتنەوەی مێردە ئیماندارەکانیان تەنانەت لە کاتی سەرەمەرگیشیاندا ئامادەی جەنازەکانیان دەبن بەتایبەتی ئەوانەی کە لە پێناوی دینی پەروەردگاردا شەهیدبوون

شەهید هەردوو هاوسەرەکەی لە حۆریەکان دادەبەزنە لای و ڕوخساری لە تۆزو خۆڵ پاک دەکەنەوەو ، پێی دەڵێن ئێستا کاتی خۆتە ، ئەویش پێیان دەڵێت ، ئێوەش ئێستا کاتی خۆتانە ...

هەروەها دواهەمین کەسی مسوڵمان کە لەناو دۆزەخ دێتە دەرەوە و دەچێتە ناو بەهەشتەوە حۆریەکەی زۆر خۆشحاڵە و پێشوازی لێ دەکات لەو مێردە مسوڵمانەی ...

ئەو مسوڵمانە کە دواین کەسە لە دۆزەخ دێتە دەرەوە دوای ئەوەی خزمەتکارانی کۆشکەکانی دەچن بۆ پێشوازی لەو خاوەن



بەهەشتیە مسوڵمانە ... یەکێک لە خزمەتکارەکانی کۆشکەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە بۆلای حۆریەکان بۆئەوەی هەواڵی گەیشتنی مێردەکەی پێ ڕابگەیەنێت و بەحۆری عەینەکە دەڵێت : ئەوا فلان کەس گەیشتە ئێرە بەوناوەی کە لەدونیادا بانگی لێکرا ، حۆریەکەش بە خزمەتکارەکە دەڵێت (لەجۆش و خرۆشیا پرسیار لە خزمەتکارەکە دەکات ) تۆ بەچاوی خۆت بینیت ؟ ئەویش دەڵێت : بەڵێ من بینیم و ئێستا دەگاتە ئێرە ، حۆریەکە ئەوەندە بەجۆش و پەرۆشە بۆ بینین و گەیشتنی مێردەکەی لەوێدا هەڵدەستێ و دەچێتە بەردەرگاو دەوەستێ .... )) .... پاشان خزمەتکارەکە دەڕوات لە پێش خۆیەوە (لەپێش پیاوە مسوڵمانەکەوە) تاکو دەرگای کۆشکەکەی بۆ دەکاتەوە ... کە سەقف و دەرگاو کێلون وکلیلەکانی لە گەوهەری ناوبۆش دروستکراوە ، وە لەپێشیەوە ژوورێکی گەوهەری سەوزی ناو سورە کە حەفتا دەرگای تیایە (هەر دەرگایەکیان دەکرێتەوە بۆ کۆشکێکی تر ) ... وە لەهەموو ژوورێکدا کەل و پەل وخزمەتکار و خێزانی خۆی تیایە کەمترینیان حۆریەکی چاوبەڵەکەو مۆخی ئێسقانی قاچی دیارە لەژێر حەفتا پۆشاکەوە (واتە مۆخەکەی تیشک دەداتەوە بۆیە دیارە) ... ئەو حۆریە چاوبەڵەکانە دێنە لای و پێی دەڵێن سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تۆی بۆ زیندوو کردینەوە و ئێمەشی بۆتۆ زیندوو کردەوە ...))

الله اکبر هاوسەرانت لە حۆری عەین نمونەیان نەبێ لە جوانیدا و خوای گەورە بەگەورەیی خۆی وەسفی جوانی و بۆنخۆشی و نوری ڕوخساریان بکات بەو شێوەیە نایابە باس لە قەشەنگی دروستکراوانی خۆی بکات لەو بەهەشتە پڕ لە نازو نیعمەتەدا ...

ئەو حۆریە نازدارانەش بەو جۆش و خرۆشی و جوانیەیانەوە بێن و پێشوازیت لێ بکەن و سوپاسی خوای گەورە بکەن لەبەرئەوەی تۆی بۆیان زیندوو کردۆتەوە و ئەوانیشی بەخشیوە بەتۆ ئیتر ئەبێ لە دوای ئەوە چ گومانێکت بەرامبەر گەورەیی و بەخشندەیی پەروەرێنت هەبێ ... لا اله الا الله ... ئیتر ئەبێ چ خۆشیەکی دونیا ماهیەتی هەبێت تا خەمی بۆ بخۆیت !؟

ژمارەی هاوسەرانی حۆری بەپێی پلەو مەکانەتی باوەڕداران جیاوازە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر ... کەمترینیان ئەوانەن کە دوو هاوسەری حۆری پێ دەبەخشرێت و هەموو پیاوێکی بەهەشتی دوو هاوسەری لە حۆری عەین هەیە و هیچ باوەڕدارێکی نیشتەجێی ناو بەهەشت بێ ژن و بێ مێرد نیە ... بەڵام شەهید حەفتاو دوو هاوسەری لە حۆری عەین هەیە

لە فەرموودەیەکی سەحیحدا هاتووە کە هاوسەرەکانی خاوەن باوەڕ لە حۆری عەینەکان زۆر زیاترن ... پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام دەفەرموویێت خاوەن باوەڕ لەبەهەشتدا چادرگەیەکی هەیە لە مرواری ناوبۆش درێژیەکەی ٦٠ میلە (واتە تەنها ڕووبەری چادرگەکە هێندەی نێوان هەردوو شاری هەولێرو کەرکوکە پڕیەتی لە کۆشک و ڤێلا ... ئەو قەسرو ڤێلایانەش ... پڕیەتی لە هاوسەری بڕوادار و بەسەریاندا دەگەڕێت و هیچ یەکێکیان ئەوی تریان نابینێت .

لەو بەهەشتە پڕ لە نازو نیعمەتەدا تۆی ئیماندار گەیشتوویت بە وڵات و مەملەکەتەکانت ... گەیشتوویت بە نیشتیمانەکانت ...

گەیشتوویت بە کۆشک و ڤێلاو چادرگەو قەسرەکانت ... گەیشتوویت بەهاوسەرە نموونەییەکانت لە پاک و خاوێنی و ناسکی و جوانی و چاوبەڵەکی و بۆنخۆشی و دەنگ خۆشیاندا ... دوای ئەو هەموو ماندووبوونەی ژیانی دونیاو ڕاکە ڕاکەکەی ناوی و هەوڵدان بۆ دونیاو پاشان نارەحەتی جیهانی بەرزەخ و نارەحەتی گۆڕەپانی مەحشەرو سەر پردی سیرات و ... هتد دوای هەموو ئەوانە دەچیتە بەهەشتەوەو ئینجا دەچیتە باوەشی ئەو هاوسەرە نمونەییانەتەوەو ئارامی و ئیسراحەت و ژیانێکی هەتاهەتایی پڕ لە خۆشی و چێژو پڕ لە نیعمەت دەژیت و لەگەڵ ئەو حۆریە قەشەنگانەدا سەرجێی دەکەیت لەخۆشترین جێگەو باخ و باخاتی سروشتە ناوازەکەی ناو بەهەشت و لەسەر سیسەمی ئاڵتوون و زیو ... هتد ... حۆریەکانیش بەخۆشترین دەنگ گۆرانیت بۆ دەڵێن بەدەنگێک کە هیچ کەسێک گوێی لێ نەبووە تۆش گوێیان بۆ دەگریت ...

ئەو حۆریە ناسک و نازدارانە بەدەنگە خۆشەکەیان لە گۆرانیەکانیاندا ئەم هۆنراوەیە دەچڕن و دەڵێن:

ئێمە باشترین ئافرەتانین
هاوژینی قەومی ڕێزگیراوانین
بەچاوی ڕەزامەندی بۆیان دەڕوانین
ئێمەین هەر دەژین و نامرین
ئێمەین هەر هێورین و ناترسین
ئێمەین هەر نیشتەجێین و لێرە دەرناکرێین

وە هەروها گۆرانی حۆریەکان بە وتنی ( سبحان الله و الحمدلله) یەو بەدوورە لەبەکارهێنانی هەموو جۆرە مۆسیقاو ئامێرێک والله اعلم

ئەوان هێندە دەنگیان خۆشە پێویستیان بە ئامێری مۆسیقا نیە

تۆ لەناو ئەو بەهەشتەداو لە وڵات و مەملەکەتەکانتدا ڕوباری تیایە دەریای تیایە خاوەنی چەندین کەشتی پێشکەوتووی ئاڵتوون و زیوی ناو بەهەشتیت بەو سروشتە جوان و قەشەنگەی دارو درەخت و بێستانەکانی سەر دەریاو ڕوبارەکان ... لەهەردوو کەنارەکەی ڕووبارەکان حۆری هەیەو لە ڕووی یەکدا بەپێوە وەستاون و گۆرانی دەڵێن بەچاکترین دەنگێک کە هەموو بونەوەران دەیبیستن ... ئەو دەنگەیان هێندە خۆشە تا وادەزانن هیچی ترنیە لەبەهەشتدا لەوە خۆشتر بێت (واتە لەخۆشی ئەو دەنگ و گۆرانیەیان بەجۆرێکە کە هۆش و عەقڵ نیعمەتەکانی تری ناو بەهەشتیان لەبیرنامێنێ ) ... ئەو حۆریانە لە گۆرانیەکانیاندا سوپاس و ستایشی پاکی و پیرۆزی خوای گەورە دەکەن .

ئەم نیعمەتی گۆرانیەی حۆریەکان و دەنگ خۆشیەکەیان مژدەیەکی گەورەیە بۆ ئەو کەسانە دەبێت کە لە دونیادا خۆیان لە گۆرانی و مۆسیقا بەدوور گرتووە تەنها لەپێناوی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگاردا .

(بۆیە تۆش بەسە واز لە گۆرانی و مۆسیقای دونیا بهێنە با لەو نیعمەتە بێ بەش نەبیت ) .



ئایا هاوسەرانی دونیای باوەڕداران چیان لێ بەسەردێت ؟ ئایا چۆن شێوەو ڕوخساریان دەگۆڕدرێت ؟

هاوسەری باوەڕدار لەدونیادا لەگەڵ مێردەکەیدا دەچێتە بەهەشتەوە ، زۆر دڵخۆش و خۆشگوزەرانن ، خوای گەورە شێوەو ڕوخساری ئەو ئافرەتانە دەگۆڕێت بۆ حۆری عەین و زۆر لەوانیش جوانتر دەبن وەکو پەروەردگار لە سورەتی الزخرف ئایەتی ٧٠ دەفەرموویێت { خۆتان و هاوسەرەکانتان بچنە ناو بەهەشتەوە } ... ئەو ژن و مێردانەی دونیا لەناو بەهەشتدا لەژێر سێبەردان وە لەسەر جێگەکانیان پاڵ دەدەنەوە ( لەناو کۆشک و ڤێلاکانیان )

پەروەردگار دەفەرموویێت { ( ئافرەتانی دونیا) دروست دەکەینەوە بە دروستکردنەوەیەکی جیاواز لە ژیانی دونیا کە توشی فەوتان نابن جارێکی تر، دروستمان کردوون هەموو کچن و هاوتەمەنن } سورەتی الواقعة ٣٦-٣٧

**تێبینی/** ئافرەتان بەدروستکردنەوەیەکی جیاواز سەرلەنوێ لاشەیان بونیاد دەنرێتەوە بەشێوەیەک ( واتە لاشەکانیان وەک هی دونیا کاتی نابن بەڵکو هەمیشەیی دەبن بەجوانترین نایابترین شێوە کە لە حۆریەکان جوانترو ناسکتر دەبن چونکە دەبنە گەورەو شاژنی حۆریەکان )

لەباسەکانی نازو نیعمەتەکانی ناو بەهەشت باسی حۆریە ناسک و نازدارەکان کراو کە خوای گەورە بە چ جوانیەک و بۆنخۆشیەک و دەنگخۆشیەک دروستی کردوون وە پێشکەش

دەکرێت بە باوەڕداران و هەروەها ئافرەتانی دونیاش کە خوای گەورە سەرلەنوێ لاشەکانیان دروست دەکاتەوەو دەیانگۆڕێت بەشێوەیەک لە حۆریەکان جوانترو نازدارتر دەبن و بگرە ئەبنە شاژنی حۆریەکانی بەهەشت لەناو وڵات و مەملەکەتەکانیاندا

لە فەرموودە شیرینەکانەوە بۆمان دەرکەوت کە هیچ مرۆڤێکی بەهەشتی بەم لاشەو پێکهاتەیەی کە ئێستا لە دونیادا هەیەتی بەو جەستەیەوە ناچێتە بەهەشتەوە بەڵکو تێکرا لاشەی پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار گۆڕانکاری گەورەیان بەسەردا دێت کە بەجۆرێک بتوانن لەوپەڕی خۆشیدا بەهەمیشەیی بژین و وە چێژ لە خۆشی و نیعمەتەکانی ناو نیشتیمان و سروشتەکانی بەهەشت بکەن

پیرێژنێکی ئەنساری هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی داوابکە لە خوا کە من بخاتە ناو بەهەشت ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەی دایکی فلان ، کەس لە پیرێژن ناچێتە ناو بەهەشت ، ئافرەتەکەش ڕۆیشت و دەستی کردە گریان ، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردەوە پێی فەرموو پیر بەپیری ناچێتە بەهەشت خوای گەورە ئەگەر ویستی لێبێ بیانباتە ناو بەهەشت دەیانکاتەوە بەکچ وەک پەروەردگار دەفەرموێت { انا أنشأنهن إنشاء * فجعلنهن أبكارا * عربا أترابا}

هەروەها ئافرەتی مسوڵمان لە قیامەتدا بۆ مێردەکەی خۆی دەبێت کە لەگەڵی ژیاوە ئەگەر یەک شوی کردبێ



ئافرەتی مسوڵمان ئەگەر لە شویەک زیاتری کردبێ لەدونیادا ئەوا بۆ دوا مێردی دەبێت کە لەگەڵیدا ژیاوە بەنمونە ئافرەتێک ئەگەر دوو یان سێ شوی کردبێت لە دنیادا ئەوا لە قیامەتدا بۆ کۆتاهەمین مێردی دەبێت

## چاکترین ئافرەتانی دونیاش کە دەچنە بەهەشتەوە چوار ئافرەتن، کێن؟ وە بۆچی ؟

١/ خەدیجەی کچی خوەیلید چونکە ئەم دایکەمان خوای گەورە لێی ڕازی بێت یەکەمین کەس بوو باوەری بە پێغەمبەری نازدار ﷺ هێنا لەکاتێکدا قەومەکەی بەدرۆیان ئەخستەوەو ئەو بەپێچەوانەوە دڵنەوایی ئەکردەوەو پشتی هاوسەرەکەی گرت و هەموو سەروەت و سامانەکەیشی خستە خزمەتی گەیاندنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە بۆیە بەو بەخشندەیی و گەورەییەی پلەی ئەوەی پێ بەخشرا کە ببێتە یەکێک لە باشترین ئافرەتانی بەهەشت

٢/ فاتمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ خوای گەورە لێی ڕازی بێت کە پشتی باوک و مێردەکەی بەرنەدا لەهەموو ئەو ناڕەحەتی و ناسۆریانەی توشی هاوسەری و باوکی دەبوو سەبری دەگرت و پشتی لێیان نەکرد ، وە فاتمە گەورەترین دیاری خاتوو خەدیجەبوو کە بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ بەجێهێت خوای گەورە لەهەموویان ڕازی بێت

٣/ ئاسیای کچی موزاحم کە ژنی گەورەترین تاغوتی مێژووی مرۆڤایەتی بووە کە فیرعەون بوو ، ئەم ئافرەتە گەورەیەبوو کە قەناعەتی بە فیرعەون کرد کە موسا علیه سلام هەڵبگرنەوەو

لەناو یەمەکەدا (یم) بەخێوی بکەن پاشان خۆی موسای پەروەردە کردو گەورەی کرد وە موسا علیە سلام ی زۆر خۆش دەویست وەک منالّی خۆی پێی گەیاند پاشان ئیمانی بەدینی الله تعالی هێنا فیرعەونیش بەهۆی کافری و سەرەڕۆیی و بێدینیەوە ئەم ئافرەتەی لەبەردەم تینی گەرمای خۆردا دانابوو عەزێت و ئازاری دەداو بۆئەوەی پاشگەزبێتەوە لە باوەڕهێنانی بە الله تعالی وە ئەیوست بەزۆر وایلێبکات کە بلّێ فیرعەون خوایە ، ئەم ئافرەتە مەزنە سەبری گرت لەسەر ئیمانەکەی و بەهۆی ئەم ئیمانە بەهێزەیەوە لەژێر تینی توندی گەرمای خۆردا مەلائیکەتەکان بەباڵەکانیان سێبەریان بۆدەکرد ، پاشان فیرعەون بڕیاری دا کە بەردێکی زۆر گەورەو زەخم بەربدەنەوە بەسەرجەستەیداو بیکوژن یان ئەوەتا پەشیمان ببێتەوە لە باوەڕهێنانی بە الله تعالی ئەوەبوو ئەم ئافرەتە هەر سەبری دەگرت و ئیمانی بەخوای گەورە پتەوبوو تا خوای گەورە کۆشکەکەی پیشاندا لەبەهەشتداو پاشان فیرعەون و دارودەستەکەی بەردە زەخم و گەورەکەیان فڕێدایە سەر جەستەیی و شەهیدیان کرد

٤/ مەریەمی کچی عمران گەورەترین تاقیکردنەوە کرا لەلایەن پەروەردگارەوە بەوەی کە کوڕێکی پێ بەخشی بەبێ باوک واتە بەبێ ئەوەی هیچ مێردێکی هەبێت یان شوی کردبێت بەمەش توشی گەورەترین بوختان و قسەی ناڕەواو نەشیاو بۆوە لەناو قەومەکەیدا وە بەهۆیەوە خێزانەکەیشی توشی قسەی نەشیاو و بوختانی جولەکەکان بوونەوە کە خێزانەکەی واتە ( ال عمران ) لەبەڕێزترین و دیندارترین و خانەدانترین خێزانی ناو



قەومەکەی خۆیان بوون ، ئەم ئافرەتە بەڕێزە سەبری گرت و بێدەنگی هەڵبژارد هەتا منداڵەکەی بوو وە هێنایە دونیاوە ئەوە بوو خوای گەورە عیسای پێ بەخشی علیە سلام وە لەئەنجامدا عیسا علیە سلام هەر بەمنداڵی و لەباوەشی دایکیدا پەروەردگار هێنایە گفتوگۆو فەرمووی من پێغەمبەرم و پەروەردگار بۆ ئێوەی ناردووم بەمەش هەموو ئەو بوختان و درۆو قسە ناڕەواو نەشیاوانەی کافرەکانی ئەو سەردەمە پوچ بوونەوە ( دیقەت بدەن کە تاقیکردنەوەیەکی زۆر قورسە بۆ ئافرەتێک کە لەناو خێزانێکی خانەداندا بێت پاشان توشی ئەو تاقیکردنەوە گەورەیە ببێت کە کوڕێکی ببێت بەبێ ئەوەی شوبکات یان مێردی هەبێت و هیچ پیاوێکیش نزیکی نەبووبێتەوە و ڕووبەڕووی قسەو بوهتانی ناو قەومەکەی ببێتەوە )

ئێستا بۆمان دەرکەوت کە بۆچی ئەم ٤ ئافرەتە لە چاکترین ئافرەتانی ناو بەهەشتن

زۆرینەی ئافرەتان بەهەشتین بەوەی کە هەر پیاوێکی بەهەشتی لە دوو هاوسەرەوە هەیەتی تا زیاتر وە هەروەها بە ژمارەی ئەو هاوسەرانەش کە حۆرین و پەروەردگار هەر لەناو بەهەشتدا دروستی کردوون .

هەروەها زۆرینەی ئافرەتان دۆزەخین چونکە کوفر بە نیعمەت دەکەن و ناشکورن و وشەی نەفرەت زۆر بەکاردێنن و ڕازی نین بەوەی خوای گەورە پێی بەخشیون وە بێ سفەتن بەرامبەر مێردەکانیان و بۆڵەبۆڵکەرن بەوەی کە مێردەکانیان لەبەیانیەوە تا



ئێوارە کار دەکات و بژێوی پەیدا دەکات ئەگەر ١٠٠ کاری باشی لەگەڵدا بکات لەبەرچاوی نیە بەس یەک جار مێردەکەی هەڵەیەکی بەرامبەر بکات پێی دەڵێ تۆ چیت بۆ من کردووە تۆ هەرگیز باش نەبوویت بۆ من واتە ١٠٠ باشەکەی مێردەکەی سفر دەکاتەوە بەهۆی یەک هەڵەوە

ئافرەتان زۆر تاوانبارن بەوەی کە حەقی سەرجێی مێردەکانیان نادەن و منەتیان بەسەرادەکەن ئەو حەقەی کە خوای گەورە لەلاشەی ئافرەتەکاندا دایناوە بۆ پیاوان بەحەڵاڵی ئەوان ئیستغلالی دەکەن بەمەش خۆیان و پیاوەکانیان توشی فەسادی و زیناو تاوانی گەورە دەکەن و توشی سزای ئاگری دۆزەخ دەبنەوە هەردوولا لەسەر ئەو تاوانە گەورەیە

زۆرینەی ئافرەتان دۆزەخین چونکە نایانەوێ خۆیان داپۆشن و ئەوە ڕەچاو ناکەن کە پیاوان زۆر هەستیارن بە جەستەی ئافرەتان بەهۆیانەوە توشی چەندەها تاوانی زینای چاو و هەست وروژاندن دەبن ئەمەش هەمووی بەزینا حساب دەکرێت لە نامەی اعمالی ئافرەتە سفورو دانەپۆشراوەکان .. ئەمە ڕاستیە کە پیاوان توشی ئەو تاوانە دەبن زۆرکات بەدەست خۆیان نیە بەڵام ئافرەتان گوێی خۆیان لەم ڕاستیە کەڕ دەکەن

لەناو بەهەشتدا هیچ پیاوێک بێ هاوسەر نابێت و هیچ ئافرەتێکیش بێ مێرد نابێت وە هەر پیاوێک لەناو بەهەشتدا دوو هاوسەر یان زیاتری دەبێت بەپێی پلەو مەکانەتیان لەناو بەهەشتدا



## پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار بوون بە پاشا و شاژن لەناو مەملەکەتەکانیان



پیاوان و ئافرەتانی یەک خواپەرست و باوەردار چوونە ناو مەملەکەتەکانی خۆیان لە ڤێلاو کۆشک و باڵەخانەکانیان ، پیاوانی باوەڕدار گەیشتن بە حۆریە ناسک و جوان و نازدارەکانیان کە نمونەیان نیە لە جوانی و دەنگ خۆشی و ناسکێتیاندا ... هتد ، وە ئافرەتانی باوەڕداریش بوونە خاوەنی چەندەها نیشتمانی گەورە لە خاکی بەهەشت واتە بوونە شاژنی مەملەکەت و نیشتیمانەکانی خۆیان لەبەهەشتدا وە شێوەو روخساریان بەجۆرێک گۆڕدرا کە لە حۆریەکان ناسکترو جوانتربوون ... هتد

ئەم پیـــاو و ئـــافرەتانە کە بوونە پاشـــاو شـــاژنی وڵات و نیشتیمانەکانی تایبەت بە خۆیان لە بەهەشتدا ، ئایا چ پۆشاکێکیان پێ دەبەخشرێ و دەیپۆشن لەناو ئەو مەملەکەتانەیاندا ؟

پۆشاکەکانیان بریتین لە ئاوریشمی سەوزی شێوەو دیزاینی جۆراوجۆر کە هەندێکیان تەنکەو هەندێکیشیان ئەستوورە

پیاو و ئافرەتانی بڕوادار ١٠٠ پۆشاکی نایابی بەبەردا دەکرێت کە هیچیان لە چنین و ڕستنی مرۆڤ نین بەڵکو لە درەختی ناو بەهەشتن ، ئەو سەد پۆشاکە لە ناسکیاندا گەر بکرێتە نێوان دوو پەنجەوە جێگەیان دەبێتەوە

**تێبینی/** ئەبێ ئەو پۆشاکانەی ئەوێ چەند ناسک و نەرم و تەنک بن کە بە سەد دانە ئینجا لەنێوان دوو پەنجەدا جێگەی ببێتەوە ! ئەبێ چەند بۆنخۆش و فەریح بن لە پۆشینیاندا وە چەندێ رازاوەبن و بە چ سەرنج راکێشیەک دیزاینی ئیلاهی کرابن لە جوانیاندا !

پۆشاکی خەڵکی بەهەشت هەمووی لە داری طوباوە دەردەچێت کە درەختێکی گەورەی بەهەشتەو ماوەی سەد ساڵە و هەموو پۆشاکی ئەهلی بەهەشت لەسەری ئەو دارەوە دێتەدەر ، پۆشاکی ئەهلی بەهەشت لەناو ناچێت و نارزێت و کۆن نابێت بەڵکو هەمیشەییە

**تێبینی/** ئەتوانین تەنها بۆ تێگەیشتن بەزمانی ئەمرۆ بڵێین کە درەختی طوبا کارگەیەکی گەورەی ئیلاهیە لە بەهەشتدا وە رووبەرەکەی ١٠٠ ساڵە یاخود کارگەیەکە لە شێوەی درەختدا واللە اعلم

سەرنج بدەن : ئەگەر ئافرەتێکی ناو بەهەشت خۆی نیشانی خەڵکی سەر زەوی بدات نێوانی ئاسمان و زەوی روناک دەکاتەوە و ئەو نێوانەش پڕ دەکات لە بۆنی خۆش و بەجۆرێک سەرپۆشەکەی سەری چاکترە لە دونیاو لە وەشی کە لە دونیا هەیە .



ئەتەویت پیش چوونە بەهەشتەوەو هەرلە گۆرەپانی قیامەتدا ئەو پۆشاکە گرانبەهاو بەنرخانە بەدەست بێنیت لە رووتی رزگارت ببێ لەکاتێکا خەڵکان لەو ساحەی قیامەتەدا رووتن و بێ پۆشاکن؟ بزانە پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەفەرموویت ؟!

دەفەرموویت هەر باوەڕدارێک دڵنەوایی برایەکی باوەڕداری بکات لە کاتی توش هاتن بە نارِەحەتیەک ئەو کەسە خوای گەورە لە پۆشاکەکانی ڕێزو سەربەرزی بەبەردا دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا.

هەر کەسێک لەبەر خۆ بەکەم زانینی بۆ خوای گەورە لە ژیانی دونیایدا جل و بەرگ و پۆشاکی نایاب و گرانبەها نەپۆشێت هەرچەندە لە تواناشیدا بێت بیپۆشێت ئەو کەسە خوای گەورە لە پێش چاوی هەموو دروستکراوانیەوە لە ڕۆژی کۆتاییدا بانگی دەکات و (لەپێشانگای پۆشاک لە گۆرەپانی مەحشەردا ) سەرپشکی دەکات لە کام جۆری جل و بەرگی باوەر خۆی پێی خۆش بێت لەبەری دەکات

ئەو دایک و باوکانەی منداڵەکانیان فێری قورئان کردووە لە قیامەتدا خوای گەورە دوو پۆشاکیان بەبەردا دەکات کە هەموو پۆشاکی خەڵکی دونیا نایانگاتێ ، وە ئەو دایک و باوکە دەڵێن ئەو پۆشاکەمان بەچی دەستکەوت ؟ پێیان دەوترێت : لەبەرئەوەی منداڵەکەتان فێری قورئان کرد ...))

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی ( هەر کەسێک پۆشاکی ئاوریشم لەبەربکات لە دونیادا ئەو کەسە لە ڕۆژی کۆتاییدا لەبەری ناکات ، گەر بشچێتە بەهەشتەوە نیشتەجێیانی بەهەشت لەبەری دەکەن بەڵام ئەو لەبەری ناکات ).



بیرخستنەوە / ئەبێ ئەو پۆشاکانەی ناو بەهەشت چەند فەریح و نەرم و تەنک و ناسک و جوان و رازاوە بن کە بە سەد پۆشاک ئینجا لە نیوان دوو پەنجەدا جێگەیان ببێتەوە ! ئەبێ چەندێ بۆنخۆش بن بەجۆرێک کە تەنها سەرپۆشی یەکێک لە حۆریە نازدارەکان لە دنیاو ئەوانەی ناویشی بەنرختر بن ، ئەبێ تاجەکانی سەریان چەندێ رەونەقدارو بریسکەداربن کە نێوانی ئاسمانەکان و زەوی روناک بکەنەوە !!!

## زێڕ و زیو و گەوهەر و مرواریەکانی ناو مەملەکەتەکان!



لە دونیادا مرۆڤەکان لە ئافرەتان و پیاوان زۆر حەزیان لە زێڕو زیو گەوهەرو مرواریە هەر بەو بۆنەیەوە پەروەردگار لەناو بەهەشتدا بازنی ئاڵتوون و زیو و مرواری دەبەخشێتە بەهەشتیەکان

پێغەمبەری نازدار ﷺ دەفەرمووێ (گەر ئێوە حەزتان لە خشڵ و زێڕ و زیو و ئاوریشمی بەهەشت هەیە ئەوا لە دونیادا لەبەری مەکەن و مەیپۆشن )

وە هەر کەسێک لە شوێنکەوتووانی ئومەتی ئیسلام ئاوریشم و ئاڵتوون بەکاربهێنێت تا مردن ئەوا ئەو کەسە خوا ئاوریشم و ئاڵتوونی بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات

رازاوەیی و جوانی و پرشنگداری زیو و مرواری و ئاڵتوونەکانی ناو بەهەشت زۆر جیاوازە لەو مرواری و ئاڵتوون و زیوانەی کە لە دونیادا هەیە بەجۆرێکە ئەگەر پیاوێک لە خەڵکی بەهەشت خۆی نیشان بدات و بازنگەکەی دەربکەوێت ئەوا روناکی خۆر ناهێڵێت وەک چۆن کاتێک خۆر دەردەکەوێت و روناکی ئەستێرەکان ناهێڵێت

تەماشای ئەو جیاوازیەی زێڕی ناو بەهەشت بکەن بەبەراورد بە زێڕی دونیا کە تەنها بازنێکی زێڕی ناو بەهەشت روناکی خۆر ناهێڵێت بەهۆی بریسکەو پڕشنگداریەکەیەوە بێجگە لە نەخشەسازی و رازاوەییەکەی !



نزمترین کەسی بەهەشت واتە ئەو کەسەی کە کۆتا کەسە دەچێتە بەهەشتەوە بڕی ئەو زێڕو زیو و خشڵەی کە پێی دەبەخشرێ یەکسانە بە بڕی هەموو زێڕو زیو و خشڵی دونیا ، ئەو زێڕو زیو خشڵانەش کە خوای گەورە دەیداتێ زۆر چاکترە لەسەرجەم زێڕو زیو و خشڵی خەڵکانی هەموو دونیا

تاجی سەری ئافرەتێکی بەهەشتی زۆر چاکترو بەنرخترە لە دونیاو لەوەش کە لە دونیادا هەیە ، حۆری عەین تاجی لەسەرەو بچوکترین مرواری تاجەکەی سەریشی نێوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ڕوناک دەکاتەوە

ئەو کەسانەی کە قورئانیان لەبەرکردووەو کاریان پێکردووە هەر لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان دێت و تکا بۆ خاوەنەکەی دەکات و دەڵێت : ئەی پەروەردگار خشڵ و زێڕو زیوی پێ ببەخشە ، خوای گەورەش تاجی ڕێزی لەسەر دەنێت ، پاشان قورئان دەڵێت : خوای گەورە بۆی زیاد بکە (واتە زیاتری پێ ببەخشە ) خوای گەورەش خشڵ و زێڕو پۆشاکی ڕێزی پێ دەبەخشێت

(( قورئان لە رۆژی قیامەتدا دەگات بە خاوەنەکەی .... پاشان موڵک دەدرێتە دەستی ڕاستی و مانەوەی هەتاهەتایی دەدرێتە دەستی چەپی وە تاجی بەها و سەنگین دەکرێتە سەری ...))

(هەر کەسێک سورەتی ئەلبەقەرە بخوێنێتەوە خەڵات دەکرێت و تاجێک دەکرێتە سەری )

(( ئەو کەسەی کە شەهید دەبێت لە پێناوی پاراستن و گەیاندنی بەرنامەی ئیسلامی خوای گەورە ئەوا ٦ شەش تایبەتمەندی بۆ هەیە : ....... لە ڕۆژی ترسناکی هەرە گەورەی قیامەتدا ئەمین دەبێت ، تاجی بەهاو سەنگینی لەسەر دادەنرێت کە بچوکترین یاقوتی ئەو تاجە چاکترە لە دونیاو لەوەشی کە لە دونیادا هەیە ))

(( خەڵکی بەهەشت شانەیان بۆ دروستکراوە لە ئاڵتوون وە لە زیو ، هەروەها قاپ و کەوچک و پێداویستیەکانیان لە ئاڵتونەو شانەکانیشیان لە ئاڵتوون و زیوە و بغوردەکانیان لە جۆری (ئەلوە)یە )).



## بەهەشتیەکان شەیدای بینینی یەکتر دەبن و سەردانی یەکتر دەکەن !

یەکێک لە نیعمەتە هەرە گەورەکان کە لەناو بەهەشتدا دەبەخشرێ بە برواداران بریتیە لە نەبوونی ماندوویێتی ، نەبوونی قسەی نادروست و نەشیاو ، نەبوونی نارەحەتی و دڵهێشان ، ئەو ئەهلی بەهەشتە هەموویان دڵیان وەک دڵی یەک پیاو دەبێت کە هیچ گەردێکیان تیا نیە بۆیەکتری لە غەیری رووخۆشی و زەردەخەنەو پێکەنین ، ئەو بەهەشتیانە هێندە رووخۆش و کامەرانن بۆ یەکتر جگە لە سەلام و سڵاو هیچی تریان نیە بۆ یەکتری هەر کە بەیەک دەگەن بەیەکتر شاد دەبن و دەڵێن سڵاوی پەروەردگارت لێبێ ، سڵاوی خوات لێبێ وە قسەی خۆش بۆیەکتر دەکەن

بەهەشتیەکان کە دەچنە ناو بەهەشتەوە هەندێکیان شەیدای بەیەکگەیشتنی هەندێکیان دەبن ، ئینجا سیسەم و شوێنی دانیشتنەکانیان لێک نزیک دەبێتەوەو بەیەک دەگەن و قسەدەکەن سەبارەت بەو ژیانەی کە لەدونیا بەسەریان بردووە ، یەکێکیان بەهاوڕێکەی دەڵێت : فڵانە کەس دەزانیت لە چ ڕۆژێکدا خوا لێمان خۆش بوو ؟ ئەوی تریان دەڵێت بەڵێ ئەوە لەو ڕۆژەدا بوو کە لە فڵان شوێن و فڵان شوێندا بووین دوعامان کرد و خوا لێمان خۆش بوو ).

ئەهلی بەهەشت هەندێکیان سەردانی هەندێکیان دەکەن لەناو بەهەشتدا باسی بیرەوەری و یادی جارانی دونیایان بۆیەکتر

دەکەنەوە و ئەو ڕووداوانەی لەنێوانیاندا ڕووی داوە بەتایبەت ئەو ڕووداوانەی کە لەنێوان خۆیان و گومڕاکاندا لە دونیا ڕوویداوە ، وەک پەروەردگار لە سورەتی الصافات ئایەتی (٥٠ تا ٥٧ ) دەفەرموێت

( کاتێ هەندێکیان بەهەندێکیان دەگەن لەبەهەشتدا پرسیار لەیەکتری دەکەن و یەکێک لە بەهەشتیەکان دەڵێت من هاوڕێیەکم هەبوو دەیوت ئایا تۆ بەراستی دەزانیت ئێمە کە بووین بە خۆڵ جارێکی تر زیندوو بکرێینەوە و لێپێچینەوەی کردەوەکانی خۆمان لەگەڵدا بکرێت ، بانگیان لێدەکرێت (واتە لەناو بەهەشتدا) ئایا پێتان خۆشە خۆتان چاوتان پێی بکەوێت ؟ ئینجا ئەو کەسە بەچاوی خۆی هاوەڵەکەی خۆی دەبینێت کە لەناوەراستی دۆزەخدایە و پێی دەڵێت : والله ی وەختەبوو منیش بەریت بەدوای خۆتا بۆ دۆزەخ ، ئەگەر نیعمەتی خوای گەورە نەبووایە بەسەرمەوە من یەکێک دەبووم لەئامادەبووەکانی تەنیشت تۆ لە دۆزەخدا ، هەر مردنەکەی یەکەم جارمان بوو ئیتر ئێمە جارێکی تر نامرین ئەی نەتبینی ئێمە زیندووبووینەوە و حسابمان لەگەڵ کرا ...)

پەروەردگار لە دیمەنێکی تردا باسی هەندێ لە خەڵکی بەهەشتمان بۆ دەکات ( لەناو بەهەشتدا هەندێکیان ڕوودەکەنە هەندێکیانی تریان دەڵێن ئێمە لەناو خەڵکی خۆماندا زۆر لە خوای خۆمان دەترساین خوای گەورە بەرەحم و بەزەیی خۆی لەسزای دۆزەخ لایداین و بەبەهەشتی بەرین شادی کردین ) الطور ٢٥-٢٧



## بەهەشتیەکان وەك هەناسەدان سوپاس و ستایشی پەروەردگار دەکەن !

خەڵکی بەهەشت لەناو بەهەشتدا وەک هەناسەدان یادو ستایشی پەروەردگار دەکەن وە چۆن کاتێک هەناسەدەدەین هیچ ماندووبوونێکی تیانیە ، ئەو سوپاس و ستایشە بەردەوام و هەمیشەییەی ئەهلی بەهەشتیش هیچ ماندووبوون و ئەرکێکی تیانیە.

ئەهلی بەهەشت بەیانیان و ئێوارانی ناو بەهەشت ( سبحان الله ، والحمدلله ، الله اکبر ) دەکەن و ئاسانە بەلایانەوە وەک هەناسەدان ،

ئەهلی بەهەشت سڵاوکردنەکەیان (السلام علیکم) ە و کۆتایی داخوازیەکانیان (الحمدلله رب العالمین) یونس ١٠

لەناو بەهەشتدا سەرماو گەرما نیە بەجۆرێک ئەهلی بەهەشت لەسەر قەنەفەو کورسیە رازاوەکان شانیان لێ داداوە کە نەگەرمای خۆری تیادا دەبینن وە نە سەرماو سۆڵە

**تێبینی/** تەماشای ئەو دڵ و دەروون ئارامیەی بەهەشتیەکان بکەن لەناو بەهەشتدا : وتەو قسەی نادروست و نەشیاو نیە ، دڵیان لەسەر دڵی یەک پیاوە ، سەرماو گەرما بوونی نیە ، لەناو کۆشک و باڵەخانەکانیاندا شانیان لێ داداوە لەسەر سیسەم و قەنەفەو کورسیە رازاوەکانیان ، ئەوانە کە دەگەن بەیەک سڵاوی پەروەردگار لەیەک دەکەن ، وەک هەناسەدان سوپاس و ستایشی

پەروەرێن دەکەن ، ئەوانە کە دەگەن بەیەک باسی بیرەوەریەکانی خۆیان کە لەدونیادا بەسەریان هاتووە بۆیەکتر دەکەن ، ئەوە ئەوپەڕی ئاسودەیی دڵو دەروون و ڕۆحی پێ دەوترێت



## دەعوەتە تایبەتیەکان لە بەیانیان و ئێواراندا لەناو بەهەشتدا !

هەروەها لەناو بەهەشتدا ڕۆژو هەفتە هەیە کە دەرگاکانی بەهەشت ڕۆژانی دوو شەممان و پێنج شەممان دەکرێنەوە (بۆئەوەی ئەهلی بەهەشت سەردانی دەرەوەی بەهەشتی گەورە بکەن والله اعلم )

ڕۆژی هەینی لەبەهەشتدا هەیەو ناودەبرێت بەڕۆژی خەڵات و دیاری زیادەکراو (یوم المزید) کە ڕۆژی هەینی سەرووەری ڕۆژەکانە و ئێمە ناوی دەبەین بە ڕۆژی زیادکراو ...) واتە هەدیە و دیاری زیاتری پەروەردگار دەبەخشرێت بە ئەهلی بەهەشت لەو ڕۆژەدا لە بازارەکانی بەهەشتدا

**تێبینی/** (لەبەشەکانی دواتر بە تەفاسیلْ باسی ئەو ڕۆژە دەکەم چونکە خۆشترینی خۆشیەکانە ئەو ڕۆژە )

لەناو بەهەشتدا بەیانیان و ئێواران هەیە وە ئەهلی بەهەشت رزق و ڕۆزیان (تایبەتیان) پێ دەبەخشرێت لە بەیانیان و ئێواراندا.

**تێبینی/** تەنها بۆ تێگەیشتن ( بەنمونە کەسێکی دەوڵەمەند پێت بڵێ تۆ هیچ ڕۆژێک خواردن ئامادە مەکە من هەموو ڕۆژێک خۆشترین خواردنت پێشکەش دەکەم و دوو ژەم خواردنی تایبەتت بە دلیڤەری بۆ دەنێرم ).

شەهیدەکانی سەرخەری دینی ئیسلامی پەروەردگار لە قەراغی رووبارێکن لای دەرگای بەهەشت لەناو گومەزێکی سەوزدان (بەنمونە فرۆکەیەکی سەوزی رازاوەدا کە وەک ڤیلا وایە ) بەیانیان و ئێواران خواردنیان لەبەهەشتەوە بۆ دێت

**تێبینی/** شەهیدەکان کاتێک شەهید دەبن هەر لەساتی رۆح دەرچوونیانەوە ئەو پلەوپێگەیەیان پێ دەبەخشرێ پێش هاتنی رۆژی قیامەت و پێش چوونە بەهەشتیانەوە

**پرسیار/** ئایا خەڵکی بەهەشت لەناو بەهەشتدا چۆن دەزانن کە بەیانیە یاخود ئێوارەیە شەوە یان ڕۆژە ؟

**وەڵام/** ئیبن عباس خوای گەورە لێی رازی بێت دەفەرمووێ ئەوانە بە ئەندازەی بەیانیان و ئێواران خواردنیان بۆ دێت .

لەبەهەشتدا شەو نیە چونکە ئەوان لە نورێکی هەتاهەتاییدان بەڵام بەیانیان پەردە هەڵدەبڕن و ئێوارانیش بەوە دەزانن کە کاتێک نور کز دەبێتەوە پەردە دادەدەنەوە واتە لەناو بەهەشتدا تاریکی شەو نیە بەڵکو زیادکردنی نورو روناکیە لە ڕۆژدا و وە کزکردنیەتی لە ئێوارانداا .

وە خۆرو مانگ بوونیان نیە لەناو بەهەشتدا بەڵکو هەر لە قیامەتدا ئەو خەڵکانەی کە لەبری خوا خۆرو مانگیان پەرستبوو هەموویان پێکەوە فڕێدرابوونە ناو دۆزەخەوە

**تێبینی/** بزانە کە لە دونیادا روناکی رۆژ جیاوازە لە روناکی خۆر ، واتە خۆرو رۆژ دوو مەخلوقی جیاوازن و هەردووکیان خولگەی



تایبەت بەخۆیان هەیەو لە دەریای ئاسماندا لەسەر خولگەکانیان دەسورێنەوەو مەلە دەکەن

### ئایا بەهەشتیەکان چۆن دەبینن لەناو بەهەشتدا ؟

وەک باسکرا نوری رۆژ لەناو بەهەشتدا هەیە بەڵام خۆر نیە ، بەنمونە تۆ بەیانیان لەدوای نوێژی بەیانی کە لە مزگەوت دێیتەوە دەبینی دونیا روناکە بەڵام هێشتا خۆر هەڵنەهاتووە ئەوە بەڵگەی بوونی ماددەی رۆژە کە جیاوازە لە خودی خۆر و تیشکەکانی .

تێبینی/ ئەگەر تێگەیشتنت قورسە بۆ ئەم بابەتی رۆژو خۆرە ئەوا دیراسەتی زەوی تەخت و جێگیر بکە ، چونکە بەبەڵگەی قورئان و سونەت و زانست و لۆژیک زەوی تەختەو مەسەلەی زەوی گۆیی و ئاسمانی بۆش و بەتاڵ لە درۆو دەلەسەو خورافات زیاتر هیچ شتێکی تر نیە

بۆیە ئەتوانین بڵێین کە ماددەی رۆژ و رۆژەکانی هەفتەو ئێواران و بەیانیان لەناو بەهەشتدا بوونیان دەبێت کە ماددەی رۆژ (نەک خۆر) بەیانیان زیاد دەکرێت و ئێواران کز دەکرێت لەناو بەهەشتدا واتە لەناو بەهەشتدا ( رۆژ هەیە ، بەیانی و ئێوارە هەیە ، نوری هەمیشەیی رۆژ زیادو کز دەکرێت و ئێوارەو بەیانی پێ دیاری دەکرێت ) .

لەناو بەهەشتدا ماددەی شەو نیە ، بۆچی ؟ چونکە خەوتن بوونی نیە ئەهلی بەهەشت ناخەون چونکە ماندووبوون و راکەراک و هیلاکی بوونی نیە لەناو بەهەشتدا تا پێویستیان بە خەو ببێت .

وە بشزانە کە خەوتن برای مردنە کەواتە وەک چۆن مردن بوونی نیە خەویش بوونی نیە .

ئاسودەترین دڵ و دەروون ، خۆشبەخترین و ئارامترین ناخ و هەست و دڵ بریتیە لە دڵ و دەروون و ناخی ئەهلی بەهەشت چونکە ماندبوون و وتەی نەشیاو و دڵهێشان بوونی نیە لەو بەهەشتەدا ئاسودەترین دڵ و دەروون لەو بەهەشتەدایە



# خۆشترین و پڕچێژترین بەشی بەهەشت بخوێننەوە



## خۆشترینی خۆشیەکان

لەناو بەهەشتدا هیچ دیمەن و نیعمەتێک نیە بگاتە خۆشی ئەم نیعمەتە نە مەملەکەت نە نیشتیمانەکانی بەهەشت نە حۆریەکان نە روبارو تاڤگەو کۆشک و ڤێلاو باڵەخانەکان نە زێڕو زیو و ئاڵتوون نە پاشایەتی نە مەلیکایەتی... هتد هیچ یەکێک لەوانە ناگاتە خۆشی ئەم نیعمەتە کە پەروەردگار دەیبەخشێتە ئەهلی بەهەشت ئەم نیعمەتە بەجۆرێکە ئەهلی بەهەشت کاتێک پێیان دەبەخشرێت ئەوا جار بۆ جار شەیدای دووبارەبوونەوەی دەکەن چونکە هیچ چێژێک و خۆشیەک نیە پێی بگاتەوە لەناو ئەو بەهەشتە خۆشەدا ئەویش بریتیە لە بینینی پەروەرێن بە چاوەکانی خۆیان

بۆچی بینینی پەروەردگار خۆشترینی خۆشیەکانە ؟

چونکە ئیتر تۆ ئەگەیت بەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی و دەریاو رووبارو تاڤگەو گیاندارەکانی بۆ دروست کردیت تا خزمەتت بکەن و بەکاریان بهێنی

تۆ دەگەیت بە لیقاو بینینی ئەو پەروەرێنەی کە تۆی لە نەبوونەوە هێنایە بوون و تەمەنێکی سێ قۆناغی (منداڵی و گەنجی و پیری ) پێ بەخشیت لەکات و بەرەوارو سەدەیەکی دیاریکراودا

تۆ دەگەیت بەو پەروەردگارەی کە دروستی کردیت وە کاتێک نەخۆش بوویت شیفای دایت ، کاتێک هەژار بوویت دەوڵەمەندی کردیت ، کاتێک منداڵ بوویت گەورەی کردیت فێری زانست و زانیاری کردیت

تۆ لەناو ئەو بەهەشتەدا دەگەیت بەو پەروەرێنەی کە رزقی ٢٠٠ ملیار خانەی لەشتی داو بەبێ ئەوەی خۆت هەستت بەگەورەبوونی ئەندامەکانی لەشت کردبێ

دەگەیت بەو خوایەی کە رەحمی پێکردیت و لە نارەحەتیەکانی ناو گۆڕو ساحەی قیامەت و پردی سیڕات رزگاری کردیت و تۆی کردە ناو مەملەکەتانێک و وڵاتانێک لەناو بەهەشتدا کردیتی بە پاشاو و شاژنی بەهەشتانێک کە دەیان و سەدان جار لەهەموو سەر زەوی و ئەوەی لەناویشیایەتی گەورەترو جوانترو رازاوەترو بەنرخترە ... هتد

ئیتر ئەبێ خۆشی هەبێ لەوە خۆشتر بێت کە بگەیتە خۆشەویستی اعلی و بەچاوەکانی سەر بیبینیت !؟

یا الله لەو نیعمەتە گەورەیە بێ بەشمان نەکەیت بۆ خاتری گەورەیی و جلالی خۆت

تەماشای ئەم پێشوازی و ڕێوڕەسمە بکەن کە پەروەردگار لەناو بەهەشتدا پێشکەشی بەهەشتیەکانی دەکات

پەروەردگار لە سورەتی القیامة ٢٢-٢٣ دەفەرموێت {ڕوخسارانێک لەو رۆژەدا تەماشا دەکەن، تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەکەن}



ڕۆژی بانگهێشت و سازکردنی لیقاو بینینی پەروەردگار تەنها لە ڕۆژانی هەینیدا دەبێت چونکە ڕۆژێکی پیرۆزو گەورەیە و سەروەری هەموو رۆژەکانی ترە

کاتێ خەڵکی بەهەشت چوونە ناو بەهەشت و خەڵکی ئاگر چوونە ناو ئاگر ، بانگکارێک بانگ دەکات و دەڵێت : ئەی خەڵکی بەهەشت لای خوای گەورە بەڵێنێک و بەیەک گەیشتنێکتان هەیە خوای گەورە پێی خۆشەو ویستی هەیە بۆتانی بهێنێتە دی وە خوای گەورە دەفەرمێت : پێتان خۆشە شتێکی زیاترتان پێ ببەخشم )) ئەوانیش دەڵێن واتە ئەهلی بەهەشت دەڵێن ئەو بەڵێن و شتە زیادە دەبێت چی بێت ؟ ئەوەتا خوای گەورە کێشانەی کارەکانی ئێمەی قورس کرد ؟ وە ڕووی سپی کردین و ئێمەی خستە ناو بەهەشتەوە ؟ ڕزگاری کردین لە دۆزەخ .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت ( جبریل هات بۆلام و ئاوێنەیەکی بەدەستەوە بوو خاڵێکی رەشی تیابوو پاشان پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویت : لێم پرسی ئەو خاڵە رەشە چیە ؟ فەرمووی ئەوە ڕۆژی جومعەیە کە قیامەت تیایدا هەڵدەستێت و سەروەری ڕۆژەکانە ئێمە لای خۆمان ناوی دەبەین بە ڕۆژی زیادکراو ، منیش وتم بۆچی وای پێ دەڵێن ؟ ئەویش فەرمووی :

خوای پەروەردگار جێگەو دۆڵێکی (لەناو بەهەشتدا) دابین کردووە لە میسکی پاکی سپی فیردەوسدا ، هەر کاتێک ڕۆژی جومعە دێت لە ڕۆژانی کۆتاییدا (( خوای گەورە ئەوەی بیەوێت لە مەلائکە دایدەبەزێنێتە ئەوێ )) ئینجا خوای گەورە لە عەرشی



خۆیەوە لە (علیین) دەچێتە سەر کورسی لە ویشەوە بۆ ئەو دۆڵە و ( چەندەها مینبەر لە چواردەوری (الكرسی) دادەنرێت لەم لاو لایەوە کە جێگەی دانیشتنی پێغەمبەرە بەرێزەکانە ، لە چواردەوری کورسی پێغەمبەرانیش چەندەها کورسی ئاڵتوون کە ڕازێنراونەتەوە بە یاقوت و زەبەرجەد (جۆرێکە لە کانزایەکی گرانبەها ) ، دابین دەکرێت و شەهیدان و پیاوچاکان و ڕاستگۆیانی لەسەر دادەنرێت ، ئەفەرموویت ئەوانیش لەدوای ئەوان دادەنیشن)) و پاشان هەموو بەهەشتیەکان دێن و لەدوای ئەوانەوە لەسەر تەپۆڵکەکان دادەنیشن ((تەپۆلەکە شوێنی تایبەت و ڕازاوەیە بۆ دانیشتن ) ، ((ئینجا پەردە لادەبرێت و تەماشای خوای گەورە دەکەن ، سوێند بە خوای گەورە پەروەردگار هیچ شتێکی پێ نەداون خۆشەویستر بێت لایان و دڵخۆشتر بێت بۆیان لە بینین و تەماشاکردنی خوای گەورە ))

پاشان خوای پەروەردگار خۆی نیشانیان دەدات تاکو ((سەیری روخساری دەکەن )) خوای گەورە بەخەڵکی بەهەشت دەفەرموویت : منم کە پەیمانەکەی خۆمم ڕاست بۆ هێنانە دی وە نیعمەتی تەواوی خۆمم پێ بەخشین و ئێوەم بەبەهەشتی شوێنی ڕێزی خۆم شاد کرد داوام لێ بکەن تا پێتان ببەخشم ... ئەوانیش هەموو دەڵێن : داوات لێ دەکەین کە لێمان ڕازی بیت ئەی پەروەردگار ، خوای گەورەش دەفەرموویت : (ڕازی بوونم بوو ئێوەی گەیاندە جێگەی پڕ ڕێز وبەخشینم ، ئەوا لە هەر هەمووتان ڕازی بووم ) ئەنجا خۆشیان بە شاهید دەگرێت کە هەموویان خوای پەروەردگار لێیان ڕازیە ، ئینجا دەفەرموویت



((... هەرچیەک ئەمڕۆ پێتان خۆش بێت لەوە زیاتریش پێتان دەبەخشم )) پاشان دەفەرموویت داوام لێ بکەن ! ئینجا هەموو داوا دەکەن تا داواکاری هەر یەکێکیان تەواو دەبێت ، پاشان خوای گەورە دەفەرموویت : بەندەکانم پۆشتە بکەن ! ئەوان لە ویدا پۆشتە دەکرێن ، پاشان دەفەرمویت : خواردن بدەن بە بەندەکانم ! خواردنیان دەدرێتێ ، پاشان دەفەرمویت : خواردنەوە بدەن بەبەندەکانم ! خواردنەوەیان دەدرێتێ ، پاشان دەفەرمویت : بەندەکانم بۆن خۆش بکەن ! بۆن خۆش دەکرێن ،

**تێبینی/** تەماشای ئەو ڕێزلێنانە بکەن کە بۆنی خۆشیان پێ دەبەخشرێ پۆشاکی گرانبەهایان پێ دەبەخشرێ ، خۆراک و خواردنەوەی بەتام و بەچێژیان پێ دەدرێت ، هەرچی داوایەکیان لە پەروەردگار هەبێت پێیان دەدات لە هەدیێ و دیاری بەدڵی خۆیان ، (لله مثل اعلى) ئایا تا ئێستا چ موناسەباتێکی ئاوا گەورە هەبووە لەم دنیایەدا لەلایەن دەوڵەمەندێکەوە پێشکەشی خەڵکان بکرێت ؟! واتە بچیتە لای دەوڵەمەندێک و ئەوەی حەزت لێ بێت لێی داوابکەیت و ئەویش پێت بدات !؟ ئەسڵەن لەوانەیە تۆ شتێک بوێت ئەو هەر نەشزانێ چیە بەس لای پەروەردگار تۆ ئەوەی بەدڵ و دەروونتدا دێت داوای بکەو پێتی دەبەخشێت

پاشان پەروەردگار دەفەرمویت : داوام لێ بکەن ؟ ئەوانیش دەڵێن : ئەوەندەمان بەسە ئەی پەروەردگار ڕازین ، پاشان پەروەردگار بەرزدەبێتەوە بۆ سەر عەرشی خۆی پاشان دەچێتە سەر ( الكرسی ) ی خۆی [ و پاشان لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان

و شەهیدەکان بەرزدەبنەوەو هەموو بەهەشتیەکان دەگەڕێنەوە بۆ جێگەی خۆیان ]، پاشان شتانێکیان پێ دەبەخشرێت کە نە چاو بینیویەتی و نە گوێ بیستوویەتی وە نەبەخەیاڵی کەسیشدا هاتووە ئەوانەیان پێ دەبەخشرێت هەتا کات و ماوەی بڵاوەکردنی خەڵکان لە ڕۆژی هەینیدا ، پاشان نیشتەجێبووانی کۆشکەکانیش هەموو دەگەڕێنەوە بۆ جێگەی خۆیان (لە نیشتیمان و وڵات و مەملەکەتەکانیان لەناو بەهەشتدا ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت ئەوان (واتە ئەهلی بەهەشت) بۆیە ڕۆژی جومعەیان پێخۆشە لەبەر ئەو خەڵاتانەی کە لەلایەن خوای خۆیانەوە پێیان دەبەخشرێت ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خوای خۆتان تیایدا چۆتە سەر عەرش ، وە ئادەمیشی تیادا دروستکردووە و قیامەتیش تیایدا بەرپا دەبێت .

بەهەشتیەکان لەناو بەهەشتدا خۆشترین ڕۆژ بەلایانەوە ڕۆژی هەینیە چونکە هەموو هەینیەک دەگەن بە لیقای نوری روخساری پەروەردگار و چێژ لە بینینی ئەو پەروەرێنە دەکەن کە هیچ نیعمەتێکی ناو بەهەشت هێندەی ئەو لیقاو گەیشتنە بە نوری ئەو پەروەرێنە خۆش نیە وە پاشان خەڵاتی بەنرخ و گەورەی ئیلاهیان پێ دەبەخشرێت وە هەر لەبەرئەوەشە ناونراوە ڕۆژی زیادکراو واتە ڕۆژی خەڵات و دیاری

**تێبینی/** ئەزانن بۆ خۆشترین نیعمەت بینینی روخساری پەروەردگارە؟ چونکە ئەو خۆشەویسترین زاتەو پەروەردگاری تۆیە ، بۆ نمونە (لله مثل اعلی) کاتێک دەچیتە مەجلیسی مامۆستایەک یان پیاوێکی

بەتەقواو زانا کە نوری ئیلاهی بەروخساریەوەیەتی و باسی ئیسلامت بۆ دەکات ئەو مەجلیسە هێندە خۆشە دوو سەعات و سێ سەعاتت لێ دەروات بەڵام هەستی پێ ناکەیت چونکە ئەو پیاوچاک و زانایە بەرەکەتی ئەو نورە ئیلاهیەی پێ بەخشراوەو تۆش چێژ لەو نورە دەبینی و ناو مەجلیسەکەش فریشتەکانی تیابەشدارن ، لەو مەجلیسانەدا تۆ ماڵ و منالْ و خانوو و ماڵت لەبیر نامێنێ هێندەن چێژ بەخشن ، ئینجا بیهێنەرە پێش چاوی خۆت لەناو خۆشترین و رازاوەترین شوێنی بەهەشتدا بچیتە مەجلیسی پەروەردگارو شاد ببیت بە لیقاو بینینی روخساری پەروەردگار کە خۆی نور بەخشە ئەبێ سات هەبێت لەو ساتە خۆشتر بێت !؟ ، ئەبێ لەو ساتەدا کە تەماشای پەروەردگار دەکەیت و چێژ لە نوری ئەو وەردەگریت تۆ بیرو هۆش و خەیاڵت لای مەملەکەتەکانت بێت لەناو بەهەشتدا !؟ نا هەرگیز چونکە بینینی پەروەردگار بە چاوەکانی سەر لە هەموو بەهەشت و مەملەکەتان و نیعمەتەکانی گەورەترو خۆشترو چێژ بەخشترە (یارب بێ بەشمان نەکەیت لە گەورەترینی نیعمەتەکان کە بینینی روخساری زاتی جلالی خۆتە )

## پاش لیقاو بەیەکگەیشتن لەگەڵ پەروەردگاردا خەڵکانی بەهەشت دەچنە بازاڕەکان



لە بەهەشتدا بازاڕێک هەیەو پڕە لە تەپۆلەکەی میسک و هەموو ڕۆژانی جومعەیەک بەهەشتیەکان دێن بۆ ئەو بازاڕە و شنە بایەکی سەرو هەڵدەکات و گوڵاوی میسک دەپرژێنێت و دێت بە ڕوویاندا و بە ڕوخسارو بەرگ و پۆشاکەکانیاندا بڵاودەبێتەوە و زیاتر پێست و ڕوخساریان جوانتر دەبێت و پاشان دەگەڕێنەوە لای هاوسەرەکانیان و دەبینن ئەوانیش پێست و ڕوخساریان جوانتر بووە، هاوسەرەکانیان پێیان دەڵێن: سوێند بەخوا ئێوە جوانتر بوون، ئەوانیش دەڵێن سوێند بەخوا ئێوەش لەدوای ئێمە جوانتر بوون.

هەروەها کاتێک خەڵکان دەچنە ئەو بازاڕە پەروەردگار بایەکی بۆن خۆش دەنێرێت و دەیکاتە ناو ماڵەکانیانەوە

**تێبینی/** مادام تۆ بۆ هەتاهەتایە لەناو بەهەشتدا دەژیت ئەوا هەموو هەینیەک گۆڕانی گەورەو نایاب بەسەر ڕوخسارتدا دێت و هەموو هەینیەک رووگەش و جوانترو ناوازەتر دەبیت لە هەینی پێش خۆی هەروەها ناوماڵ و مەملەکەتەکانیشت جوانترو رازاوەتر دەبنەوە و هەفتە بۆ هەفتە گۆڕانیان بەسەردا دێت! بۆچی؟ چونکە ئەگەر تۆ بۆ هەتا هەتایە لەناو یەک جۆر دیزاینی کۆشک و مەملکەکەتدا بژیت بێزار دەبیت واتە ئەگەر هەر هەمان شێوەی قەسرو ماڵت هەبێت

هەروەها ڕوخسارت هەموو هەفتەیەک بە شنەبایەکەو نوری ئیلاهی جوانترو گەشتر دەبێت

هەروەها لەبەهەشتدا پەروەردگار دوای بینینی زاتی گەورەیی خۆی، پێتان دەفەرمووێ چ داوایەکتان هەیە بیکەن پێتان دەبەخشم، پاش ئەو لیقایە خەڵات و دیاری دەبەخشێ بە ئەهلی بەهەشت کە نە چاو بینیویەتی نە گوێ بیستوویەتی نە بەخەیاڵ و ختورەش بەدڵدا هاتووە، واتە بەدڵی خۆت دیاری و خەڵات داوابکەو بیبەرەوە

تۆ تا ئێستا دیاریان بۆ هێناوی؟ ئەوانەی کە دیاریان بۆ هاتووە لەلایەن خزم و کەس و هاوڕێکانیانەوە هەستێکی زۆر تایبەت و خۆش لەناخیانا دروست دەبێت

(ناتوانرێ بەنوسین ئەو هەستە دەرببڕێ ئیلا ئەوانەی هەدییان بۆ هاتووە ئەتوانن لەم هەستە تێبگەن )

پەروەردگار بازاڕی لەبەهەشتدا ئامادەکردووە تا هەموو هەفتەیەک لە ڕۆژی هەینیدا ئەهلی بەهەشت دوای بینینی پەروەردگار بچنە بازاڕەکانی بەهەشت و بەئارەزووی خۆیان دیاری و خەڵاتی پەروەردگاریان پێشکەش بکرێت و بیبەنەوە لەگەڵ خۆیاندا

بیهێنە پێش چاوی خۆت تۆ لە ساڵێکدا یەکجار یان دوو ساڵ جارێک هەدییەکی بچوک ئەکرێی چ هەستێکی خۆشت بۆ دروست دەبێت !؟

ئەی لە بازاڕە ناوازەکانی ناو بەهەشتدا کاتێک دیاری ئیلاهیت پێشکەش دەکرێت (ئەبێ چ هەدییەک بێت !!! چەنێ گەورەو بەنرخ بێت!؟ ) ئەبێ چ هەستێکی خۆشت بۆ دروست ببێت !!! وەسف ناکرێت

خوایە بێ بەشمان نەکەیت لە بینینی خۆت و بەهەشت و دیاریەکانی ناوی

ئێمە کاتێک هەدیەیەکی دنیایی دەکرێین لەلایەن خزم و کەس و هاوڕێکانمانەوە ( بەنمونە ئایفۆنێکت هەدیە دەکەن ) چ هەستێکی خۆش و ناوازەت بۆ دروست دەبێت و چێژ بە دڵتدا دێت ! ئەی دەبێ ئەو دیاری و خەڵاتانەی پەروەردگار چەند گەورەو بەنرخ و چێژ بەخش بن !!؟ ناتوانم دەری ببڕم چونکە خۆشی و گەورەیی ئەو وەسفە کاتێک دەکرێت دوای ئەوەی پێی دەگەیت .




وێنەکە / بەنمونە لەدونیادا پێت بڵێن بچۆرە ئەم بازاڕو مۆڵەوە حەزت لەهەرچیەک بوو بیبەرەوە



بیهێنە پێش چاوەکانی خۆت تۆ کراویت بەخاوەنی مەملکەتانێک و وڵاتانێک بوویتەتە پاشای وڵاتانێک لەناو بەهەشتی گەورەدا کە لەجوانی و رازاوەیی ئەو مەملەکەتانەدا هیچ زارێک توانای وەسفکردنی نیە ، هیچ چاوێک بەرگەی قەشەنگی و بەنرخی ئەو کۆشک و تەلارو رووبارو باخیرەو ناوماڵە زیو و ئاڵتوونانەی ناو نیشتیمانەکانت ناگرێت

سروشتی بەهەشتەکانت بە بەروبووم و باڵندەکانیەوە ناتوانرێت دەرببردرێت و وەسفیان بکرێت تاوەکو نەچیتە ناویان و بەچاوەکانی خۆت تێر تەماشایان نەکەیت

بێجگە لەو هەموو خۆشیانەی پێی شاد بووین هێشتا وەسفی ئەو خۆشی و ئارامی و کامەرانیەی کە خوای گەورە دەیبەخشێتە دڵ و دەروونەکانتان لەولاوە بوەستێ واتە بەهەمیشەیی لە دڵ و دەروونێکی ئارامدا دەژین و بەبەردەوامی دڵەکانتان چێژی خۆشیان پێدا دێت هێندە دڵخۆش دەکرێن ناتوانم دەری ببڕم ... هتد

## ئایا ئەزانیت ئەگەر تۆ هەر ئاواتێك و داوایەکت هەبێ بۆت دێتە دی



یەکێک لەو خۆشیانەی کە پەروەردگار پێتان دەبەخشێت ئەوەیە تۆ دڵ و دەروونت چی بخوازێت بۆی دێتە دی و زۆر لەوە زیاتریش .... تەماشا بکەن و چێژ وەرگرن لەو نیعمەتانە

پەروەردگار لە سورەتی فصلت ئایەتی ٣١ دەفەرمووێ {ئێمە هاوکار و پشتیوان و دۆستی ئێوە بووین لە ژیانی دونیا و قیامەتیشدا ، وە بۆ ئێوە هەیە لە بەهەشتدا ئەوەی کە نەفستان پێی خۆشە و ئەوەش کە داوای دەکەن } .

هەروەها دەفەرموویێت لە سورەتی الزخرف ٧١ { لەسەر سینی و کوپی ئاڵتون جۆرەها خواردن و خواردنەوەی جوان و رازاوەو بەتام و بۆن خۆشیان بەسەردا دەگێڕن و لە بەهەشتدا هەموو ئەو شتانە هەیە کە نەفس ئارەزووی لێیەتی و چاویش پێی خۆشە وە ئێوە بەنەمری تیایدا دەمێننەوە } .

خەڵکی بەهەشت کە جووت دەبن لەگەڵ خێزانەکانیان منداڵبوونی تێدا نیە چونکە پێویستیان پێی نیە ، وە منداڵبوون تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە خۆیان پێیان خۆشە منداڵیان ببێت

بەنمونە/ گەر مسوڵمان پێی خۆش بوو منداڵی ببێت لەناو بەهەشتدا ئەوکات سک پڕیەکەی و دانانەکەی و گەنجیەکەی و گەورەبوونی وەک خۆی ئارەزووی لێیەتی لەیەک کاتدا ڕوودەدات.



**تێبینی/** ئەم خواستە مژدەیەکە بۆ ئەو دایک و باوکە باوەڕدارانەیە کە خوای گەورە لە ژیانی دونیایاندا بەمنداڵ نەبەخشین تاقیکردوونەتەوەو منداڵی پێ نەداون و توانای مناڵ خستنەوەیان نەبووە .

تۆ بیهێنە پێش چاوەکانت کە خوای گەورە کاتێک لە دونیادا دیاری منداڵ دەبەخشێ پێت چەند مانگ چاوەڕێ دەکەیت کە لەدایک دەبێت لەهەر قۆناغێکی تەمەنیدا خۆشیەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ دڵی ئەو دایک و باوکە ، ئەی دەبێ بەخشینی منداڵی ناو بەهەشت چەندێ چێژ بەخش بێت بۆ ناو دڵ کاتێک دیاریکردنی لەدایک بوون و گەشەکردنی و گەورەبوونی قۆناغەکانی تەمەنی لەسەر ویست و خواستی خۆت بێت ، ئەی دەبێت لەوە خۆشتر هەبێت تۆ داوا لە پەروەردگار بکەیت کە شێوەو روخسارو رەنگی چاو و باڵاو رەگەزی لەسەر داواکاری خۆت بێت و ئەویش بەو شێوەیە پێت دەبەخشێ کە خۆت خواستت لێیە .

جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو قسەی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد و پیاوێکی دەشتەکی لای دانیشتبوو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ( پیاوێک لە خەڵکی بەهەشت ئیزنی لە خوای پەروەردگار وەرگرت کە کشتوکاڵ بکات ، خوای گەورە پێی فەرموو : ئایا هەموو ئارەزووەکانت نەهاتەدی !؟ ، ئەویش دەڵێ : بەڵێ ئەی پەروەردگار بەڵام حەزدەکەم کشتوکاڵ بکەم ، خوای گەورەش ڕێگەیدا و ئەو کەسە خێرا کەوتە کشتوکاڵ کردن و کشتوکاڵەکەشی هەر بە تۆوکردن و بەرزبوونەوە و دروێنەو کۆکردنەوەی بەوێنەی

شاخە بەرزەکان لەچاو تروکانێکدا ڕوودەدات ، خوای گەورەش دەفەرموویێت : بگرە ئەی ئادەمیزاد هیچ شتێک تێرت ناکات ). پیاوە دەشتەکیەکەش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا بەو خوایە لەوە دەچێ ئەو پیاوەیان قورەیشی بێ یا ئەنصاری بێت چونکە ئەوان خاوەن کشتوکاڵن و ئێمە خاوەن کشتوکاڵ نین ، پێغەمبەری خواش بەم قسەیە هاتە پێکەنین )).

**تێبینی/** ئەبێ ناو ئەو بەهەشتە لە ڕووی تەکنەلۆژیاوە چەندێ پێشکەوتووبێ کە کشتوکاڵکردن هەر لە تۆوکردن و بەرزبوونەوە و دروێنەو کۆکردنەوەی چاوتروکانێک بخایەنێت

بەراوردی تەکنەلۆژیای ئەمڕۆ بکەن بۆ کشتوکاڵ لەچاو ٧ سەدە پێش ئێستاو ئینجا دیقەت بدەن کە کشتوکاڵ کردنی ئەمڕۆ چەند زۆرو خێرایە لەچاو حەوت سەدە پێش ئێستا بەهۆی تەکنەلۆژیاوە ، ئەی دەبێ تەکنەلۆژیای ئیلاهی چۆن بێت لەناو بەهەشتدا !؟

**تێبینی/** لەم فەرموودەیەوە بۆمان دەرکەوت کە نەک کشتوکاڵ بەڵکو تۆ هەر حەزو ئارەزوو و خواستێکت هەبێ بۆت دێتە دی و بگرە لەوە زیاتریش

بەنمونە تۆ ئێستا حەزت بە گرانترین جۆری ئۆتۆمبێل و جوانترین کۆشکە کە لە مرواری و گەوهەر دروستکرابێ لەناو بەهەشتدا داوای بکە بۆت دێتە دی ، بەنمونە تۆ حەزت لە جوانترین مۆبایلە داوای بکە پێت دەبەخشرێ بگرە لەوە زیاتریش بۆچی ؟ چونکە تۆ هەموو لاشەو مەودای بیرکردنەوەو هۆش و عەقڵت لەڕووی پزیشکی و

فیزیۆلۆجیەوە گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتووە لەپێش دەرگاکانی بەهەشتدا ، واتە لاشەت وەک ئەم لاشەیەی ئێستات نیە کە ئەم باسی بەهەشتە دەخوێنیتەوە ، بەڵکو بیرکردنەوەو خواستەکانت تایبەت دەبێت بە پێشکەوتوویی و تەکنەلۆژیای ناو بەهەشت واتە بۆ نمونە ئەو ئامێرانەی کە ناومان ناوە ئۆتۆمبێل و فڕۆکە یاخود میترۆ و قیتار یاخود ئەو ئامێرانەی ناومان ناوە کەشتی و باخیرەو یەخت و غەواص ... هتد زۆر لەمانەی ئێرە جوانترو بەنرخترو پێشکەوتوترن کە تۆ داوایان بکەیت و تەنها دڵت ئارەزووی بکات پێت دەبەخشرێت ... هتد بگرە نەک ئەمانە بەڵکو نیعمەتانێکی تر هەن کە من و تۆ نایزانین و نەمانبینیوەو لەزیهنماندا بوونی نیە .

## نیعمەتەکانی ناو بەهەشت وەسف ناکرێن؟ چۆن؟ خوێنەربە



بەهەشت بارەگای گەورەی هەموو نیعمەتەکانە ، بەهەشتیەکان تیایدا لەو نیعمەتانە لە کەیف و خۆشیدان بەبەردەوامی کە پەروەرێن پێی بەخشیون بەشێوەیەکە لە ژماردن نایەن ،

(هەر کەسێک بچێتە ناو بەهەشت هێندە خۆش گوزەران دەبێت هەژار نابێت وە هەتاهەتایە دەمێنێتەوە و نامرێت و پۆشاکەکانیان کۆن بوون و ڕزینیان بەسەردا نایەت و گەنجێتیشیان لەناو ناچێت).

هەر لەو ساتەوە کە بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە بانگکارێک جاڕ دەدات و دەڵێت : (ئێستا کاتی ئەوە هاتووە (ئێوە) بە خۆشگوزەرانی بژین و هەرگیز هەژارو بێ هیوا نەبن ..)

دڵنیابە کە هەموو سامانی ئەم دونیایە بستێک خاکی بەهەشت ناهێنێت بەشێوەیەک ( ...دارکەوانی یەکێکتان یاخود جێ دەستی یەکێکتان لەبەهەشتدا زۆر چاکترە لە دونیاو لەوەیشی کە لەودنیادا هەیە ... ).

**تێبینی/** دارکەوان یاخود جێدەستی یەکێکتان واتە هێندەی قەبارەی دەستت لەناو خاکی بەهەشتدا زۆر چاکترو گرانبەهاترە لە هەموو ئەم دونیایەو ئەوەیشی لەناویدایە



پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت ( گەر بە وێنەی سەرە نینۆکێک لەوەی لە بەهەشتدا هەیە دەرکەوێت نێوانی هەموو ئاسمانەکان و زەوی ڕووناک دەکاتەوە ، وە گەر پیاوێک لە خەڵکی بەهەشت خۆی نیشان بدات و تەنها یەک بازن لە بازنەکانی دەرکەوێت ، ڕوناکی بازنەکەی ڕووناکی خۆر دەشارێتەوەو دەسڕێتەوە وەک چۆن ڕوناکی خۆر ڕووناکی ئەستێرەکان دەشارێتەوە ).

( گەر یەکێک لە پیاوە خاوەن پلە بەرزەکانی بەهەشت دەرچێت و بەناو موڵکەکەیدا کۆشکێک نامێنێت لە کۆشک و تەلارەکانی ناو بەهەشت هەر هەموو نورو ڕوناکی ڕوخساری ئەو کەسە دەچێتە ناویەوە و بەهەشتیەکانی تر دەڵێن : ئای لەو بۆنە چەند خۆشە ئەوە پیاوێکە لە خاوەن پلە بەرزەکانی (عليين) چۆتە دەرەوە بە موڵکەکەیدا دەگەڕێت ...)

یارب بمانکەیتە خاوەن پلەکانی عليين بەگەورەیی خۆت

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت ( والله یی دونیا لە ئاستی ڕۆژی کۆتایدا وەک ئەوە وایە یەکێکتان پەنجەی بکاتە ناو دەریایەکەوە و پاشان تەماشا بکات پەنجەی چی لەگەڵ خۆیدا دێنێتە دەرەوە )

تێبینی : واتە بەنمونە تۆ ئەگەر بچیتە سەر دەریای ناوەراست و پەنجە بچوکەکەت بکەیتە ناو دەریاکەوە کاتێک دەرتکردەوە چەنێک لەئاوی دەریاکەی لەگەڵ خۆی هێنایە دەرەوە ئەوا نیعمەتەکان و دروستکراوەکانی دونیا لەچاو یاخود لەئاستی ناو بەهەشتی ڕۆژی کۆتاییدا هەر ئەوەندەیە (واتە لە رووی

نیعمەتەوە) بەنمونە کاڵاو شت و مەک و ڤێلاو سروشت و میوەو باڵندەو گیانەوەرو خۆراک و خواردنەوە .. هتد و زۆر زۆری تر کە نەمانبینیون نازانین چین .!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی ( هەژارترین کەسی خەڵکی دونیا دەهێنرێت و هەڵدەکێشرێت لە بەهەشتدا و پێی دەوترێت ئەی ئادەمیزاد ئایا هەرگیز لەژیانتدا نارەحەتیت بەسەردا هاتووە ؟ ئایا لەژیاندا هەرگیز هەژاریت بەخۆوە بینیوە ؟ ئەویش دەڵێت : نەخێر واللە یی ئەی پەروەردگار هەرگیز نارەحەتیم نەدیوە وە هەرگیز هەژاریم بەسەردا نەهاتووە ). لەبەرئەوەشە (( هەر کەسێک بچێتە ناو بەهەشتەوە پێی خۆش نیە بگەڕێتەوە بۆ دونیا گەر هەموو شتانی سەر زەویشی بدرێتێ ... بگرە ئەگەر ١٠ ئەوەندەی هەموو دنیاشی بدرێتێ )).





**تێبینی/** وێنەکان مرۆڤەکان دروستیانکردووە بەو زانستەکەمەی کە پەروەردگار پێی بەخشیون ئەی دەبێ خوای گەورە لەناو ئەو مەملەکەتە پێشکەوتووانەی بەهەشتدا چی بونیاد نابێ و بەدیهێنابێ بە زانستی ناکۆتای خۆی

زۆر خۆشی و چێژو نیعمەتی ناو بەهەشتم باسکرد بۆتان ، خۆشیەکان تا وەسفبکرێن هێشتا حەقی خۆیم پێ نەداوە و زۆر لەوە زیاترو جوانترو بەچێژترە کە وەسف و سەنای دەکەم ... هتد



## نەمانی پیری و مردن

### نەمان و کۆتایی هاتنی پیری و مردن :

خەڵکی بەهەشت گوێیان لە جۆرەها بانگەوازی جیاواز دەبێت کە زیاتر خۆشحاڵیان دەکات وە هەموو بانگەوازەکانیش مژدەی خۆشن وەک : بینینی پەروەردگار و نەمانی مردن و نەمانی پیری ... هتد

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئایەتی ٤٣ ی سورەتی اعراف دەفەرموویێت ((کاتێ خەڵکی بەهەشت دەچنە ناو بەهەشتەوە ، بانگدەرێک بانگەواز دەکات و دەڵێت : ئەی خەڵکی بەهەشت ئێوە ئیتر هەمیشە لەش ساغ دەبن و قەت نەخۆش ناکەون وە هەمیشە زیندوو دەبن و قەت نامرن وە هەر گەنج دەبن و پیری ڕووتان تێ ناکات وە هەمیشە خۆش گوزەران دەبن و هەرگیز هەژاری بەخۆتانەوە نابینن وە ئەمە ئەو ئایەتەی خوای گەورەیە کە دەفەرموویێت { .... کاتێک کە بانگیان لێکرا (لەبەهەشتدا) پێیان وترا : ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە پێتان دراوە بەهۆی کارو کردەوەکانتانەوە کە ئەنجامتان دەدا }.

یەکێک لە نیعمەتە گەورەکانی ناو بەهەشت بریتیە لەنەمانی مردن و کۆتایی هێنان بەمردن واتە مرۆڤەکان بۆهەتاهەتایی لەناو نازو نیعمەت و خۆشیدا دەژین وەکو خوای گەورە دەفەرموویێت {لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ } الحجر ٤٨



پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت ( کاتێ خوای گەورە خەڵکی بەهەشت دەخاتە ناو بەهەشتەوە خەڵکی دۆزەخیش دەخاتە ناو دۆزەخەوە مردن (( لەشێوەی بەرانێکی زۆر سپیدا دەهێنرێت و دەست و قاچی دەبەسرێتەوە ) (تاکو دەوەستێنرێت) لەسەر ئەو دیوارەی کە لەنێوان خەڵکی بەهەشت و خەڵکی دۆزەخدایە پاشان دەوترێت : ئەی خەڵکی بەهەشت ( ئەوانیش خۆیان دەردەخەن بەترس و لەرزەوە نەوەکا دەربهێنرێن لەو جێگەیەی کە ئەوانی تێدان ، پاشان بانگ لە خەڵکانی دۆزەخ دەکرێت : ئەی خەڵکانی دۆزەخ : ئەوانیش خۆیان دەردەخەن و خۆشحاڵن بەهیوای ئەوەی کەلەو جێگایەیان دەربهێنرێن) وە هیوایان وایە تکایان بۆ بکرێت

( دەوترێت بەهەردوولا: ئایا ئەمە دەناسن: هەمووان دەڵێن (بەڵێ) ناسیومانە ئەوە مردنە کە سپێردرابوو بە ئێمە وە (هەموو چاوییان لێیەتی و دەیبینن) دەفەرموێت: فەرمان دەکرێت ئەو بەرانە (پاڵبخرێت و سەر ببڕدرێت) (وەک چۆن مەڕ سەر دەبڕدرێت ، لەسەر دیوارەکەی نێوان بەهەشت و دۆزەخ ئەو بەرانە سەردەبڕدرێت) پاشان بەهەردوولا دەوترێت : (ئەی خەڵکی بەهەشت ئیتر بەهەتاهەتایی تیایدا بمێننەوە و مردن نیە وە ئەی خەڵکی دۆزەخ ئێوەش هەتا هەتایە تیایدا بمێننەوە و مردن نیە )) .

لەوێدا خەڵکانی بەهەشت دڵنیاو دڵخۆش دەبن بەڵام خەڵکانی دۆزەخ هیوابراو دەبن (وە خەڵکانی بەهەشت ئەوەندەی تر خۆشحاڵ دەبن وە خەڵکانی دۆزەخیش خەفەت و ناخۆشیان ئەوەندەی تر زیاد دەکات پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی



خوێندەوە [وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ] مریم ٣٩ پاشان بەدەستی ئیشارەتی بۆ دونیا کرد

واتە { ئەی محمد ئاگاداریان بکەوە لەو ڕۆژەی کە پەشیمان دەبنەوە کە ڕۆژی قیامەتە کاتێک کە هەموو شتێک بڕیاری لەسەر ئەدرێ و یەکلا ئەکرێتەوەو کۆمەڵێک بۆ بەهەشت و کۆمەڵێک بۆ دۆزەخ جیا دەکرێتەوە بەڵام ئەوانەی ئێستا لە دونیان بێ ئاگان وە ئەوان ئیمان ناهێنن}.

تێبینی/ ئەبێ چ هەستێکی خۆش لەو ساتەدا بەدڵ و دەروونتدا بێت کاتێک بۆ هەتا هەتایە مردن لەناو دەبرێت و بەهەمیشەیی لەناو ئەوپەڕی خۆشی و نیعمەتدا دەژیت لەناو مەمەلکەتانێک و نیشتیمانانێکی خۆت لەناو بەهەشتێکی زۆر زۆر پێشکەوتووی تەکنەلۆژیای ئیلاهیدا . بەشێوەیەکە کە نەپیربوون نەخەم نە گەرما نەسەرما نە ترس و ماندووبوونی تێدانیە جێی خۆشی و ئارامیە



## ئایا کەمترین پلەی بەهەشت چەند هێندەی هەموو دونیایەو چۆنەو بۆکێیە ؟



### سەرەتا چەند ڕیوایەتێک :

(( پێغەمبەر موسا علیە سلام پرسیاری لە خوای گەورە کرد کەمترین پلەی خەڵکی بەهەشت چەندە ؟ فەرمووی پیاوێکە دێت ، دوای ئەوەی خەڵکی بەهەشت دەکرێنە ناو بەهەشت ، پێی دەوترێت : بچۆرە ناو بەهەشت ئەویش دەڵێت : خوایە چۆن بچمە ناو بەهەشت دوای ئەوەی خەڵکان هەموو شوێن و پلەی خۆیان دەست کەوتووە ؟ پێی دەوترێت : ئایا ڕازی دەبیت بەقەدەر پاشایەک لە پاشاکانی دونیا بۆتۆ بێت : ئەویش دەڵێت بەڵێ ڕازیم ، وە دەفەرموێت : ئەوا ئەوەندەو ئەوەندە و ئەوەندە و ئەوەندەی تریش بۆ تۆ ، لە پێنجەمدا (پیاوەکە) دەڵێت : ڕازیم ئەی پەروەردگار ، وە خوای گەورە پێی دەفەرموێت : ئەوەندەو ئەوەندەی تریش بۆتۆ ، وە چی نەفست پێی خۆشە و چاوت پێی خۆشە بۆتۆ ، ئەویش دەڵێت : ڕازیم ئەی پەروەردگار ..... )).

لەڕیوایوتێکی تردا ( [پیاوەکە] داوا دەکات و خوای گەورە زۆر شتی بەبیر دەهێنێتەوە تا داوای بکات و دەڵێ ... ئەوەو ئەوە داوابکە و ئاوات بخوازە ).

لەفەرمووودەیەکی تردا ( پێی دەوترێت ئاوات بخوازە ، ئەویش دەڵێت: خوای گەورە خەڵکی دونیا لەسەر دونیای خۆیان پێشبڕکێی یەکتریان دەکرد بۆ بوون بەخاوەنی منیش داوای هاوشێوەی دونیات لێ دەکەم ، پێی دەوترێت : هاوشێوەی دونیا لەگەڵ دە ١٠ ئەوەندەی دونیا بۆتۆ ، ئەوە کەمترین جێگەو پلەی خەڵکی بەهەشتە ).

ابن مسعود خوای گەورە لێی ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

( دواهەمین کەس کە لە [ لە دۆزەخ دێتە دەرێ لە مسوڵمانان] ئەو کەسەیە کە نورێکی کەمی پێ دەدرێت لەسەری پەنجە گەورەی جارێک هەڵدەبێت و جارێک دەکوژێتەوە تاکو دەچێتە سەر پردی صیرات کە دەپەڕێتەوە دەستێکی دەخزێت بەدەستەکەی تری خۆی دەگرێتەوە و قاچێکی هەڵدەخزێت و بەقاچەکەی تری خۆی دەگرێتەوە دەڕوات بە سکە خشکێ تا دەچێتە ئەوبەرو ئەملاوئەولای ئاگری بەردەکەوێت بەم شێوەیە دەبێت تاکو دەپەڕێتەوە و ڕزگاری دەبێت کە دەچێتە ئەوبەر بەپێوە دەوەستێت و سەیری پردی صیرات دەکات و دەڵێت : سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەوەی کە بەخشیویەتی بەمن نەی بەخشیوە بەهیچ کەسێک کە ڕزگاری کردم لە ئاگر لەدوای ئەوەی کە بەچاوی خۆم بینیم ، ئەنجا ئەو پیاوە دەبرێت بۆلای تاڤگەی ئاوێک کە لەبەردەم دەرگای بەهەشتدایە خۆی تێدا دەشۆرێت و ڕەنگ و بۆنی بەهەشتیەکانی بۆ دەگەڕێتەوە و لەوێدا لەدەرگای بەهەشتەوە



هەموو ناو بەهەشت دەبینێت و پاشان دەڵێت : ئەی پەروەردگار بمخەرە ناو بەهەشتەوە ؟ خوای گەورە پێی دەفەرموویێت : ئایا داوای بەهەشت دەکەیت دوای ئەوەی لە دۆزەخ رزگارم کردیت؟ ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگار لەنێوان من و بەهەشتدا پەردەیەک دروست بکە تا گوێم لەدەنگی ناو بەهەشت نەبێت، ئینجا دەکرێتە ناو بەهەشتەوە و کۆشکێکی بەرزی پێ نیشان دەدرێت لەبەردەمیدا کە وادەزانێت ئەو لەخەیاڵدایە وە دەڵێت : ئەی پەروەردگار ئەو کۆشکەم پێ ببەخشە ؟ خوای گەورەش پێی دەفەرموویێت : گەر ئەو کۆشکەت بدەمێ ئایا داوای کۆشکی تر دەکەیت ، ئەویش دەڵێت : نا سوێند بە شکۆمەندی تۆ داوای کۆشکی ترت لێ ناکەم جا کۆشک هەیە لەوە باشتر بێت ؟ ئەنجا خوای گەورە کۆشکەکەی دەداتێ و دەچێتە ناوی . وە لەبەردەم ئەوەوە کۆشکێکی تر دەبینێت وادەزانێت ئەوەی تیایەتی بەلای ئەوەوە خەیاڵە ، ئەنجا دەڵێت : ئەی پەروەردگار ئەو کۆشکەم پێ ببەخشە : خوای گەورەش دەفەرموێت : گەر ئەو کۆشکەت پێ ببەخشم داوای کۆشکی تر دەکەیت ؟ ئەویش دەڵێت : نەخێر سوێند بەشکۆمەندی تۆ ئەی پەروەردگار داوای هیچی تر ناکەم چ کۆشکێک دەبێ لەوە چاکتر بێت ! ئەنجا ئەو کۆشکەشی پێ دەبەخشێت پاشان بێدەنگ دەبێت ، خوای گەورەش دەفەرموویێت : ئەوە چیتە بۆ داواناکەیت ؟ ئەویش دەڵێت : پەروەردگارم ئەوەندەم لێ داواکردیت تا شەرمت لێ دەکەم کە داوای شتی تر بکەم وە ئەوەندەم سوێند بۆ خواردیت تا تەواو شەرمت لێ دەکەم ، خوای گەورەش دەفەرموویێت : ئایا رازی نابیت بە وێنەی

هەموو دونیات پێ ببەخشم لەو ڕۆژەی کە دروستم کردووە تاکو ئەو ڕۆژەی لەناوم بردووە و هاوشێوەی ئەوەش ؟ ئەویش دەڵێت ئایا گاڵتەم پێ دەکەیت تۆ پەروەردگاری بەدەستەڵاتی ؟ خوای گەورەش بە قسەی ئەو پیاوە پێدەکەنێت :...... خوای گەورە دەفەرمویێت : نەخێر من تونام بەسەر ئەوەدا هەیە داوابکە : ئەویش دەڵێت بمگەیەنەرە خەڵکان ، خوای گەورەش دەفەرموێت : بگە بە خەڵکان ئەویش دەچێت بەخێرایی لەناو بەهەشتدا دەڕوات تا نزیک دەبێتەوە لە خەڵکان ،

**تێبینی/** دەبێت چ سیستەمێکی هاتووچۆی پێشکەوتوو هەبێت (بەنمونەو تەنها بۆ تێگەیشتن میترۆ یان فڕۆکە یان ئۆتۆمبێلێکی زۆر نایاب ... هتد ) لەناو ئەو بەهەشتە گەورەیەدا کە ئەم پیاوە بەخێرایی بەناویدا دەگەڕێت و دەگات بە خەڵکانی ناو بەهەشت و دەیانبینێ

ئینجا کۆشکێکی مرواری دێتە بەرچاوی ئەویش یەکسەر بەسوجدەدا دەچێت ، پێی دەوترێت سەرت بەرزبکەرەوە ئەوە چیتە ، ئەویش دەڵێت : خوای پەروەردگارم بینی یان خوای گەورە خۆی نیشان دام ، پێی دەوترێت : بەڵام ئەوە کۆشکێک بوو لە کۆشکەکانی تۆ ،

[[تێبینی: دەبێ ئەو کۆشکانە چەنێ جوان و ڕازاوە بن وا ئەم پیاوە هەر بەبینینی یەکسەر بەسوجدەدا چوو !؟ ]] ،

پاشان بە پیاوێک دەگات ئەویش خۆی ئامادە دەکات تا سوجدەی بۆ بەرێت پێی دەوترێت : بوەستە ئەوە چی دەکەیت ئەویش دەڵێت :



وا هاتە بەرچاوم کە تۆ یەکێک بیت لە فریشتەکان !؟ ئەو کەسەش پێی دەڵێت : من تەنها دەرگاوانی کۆشکەکەی تۆم و بەندەو خزمەتکاری تۆم هەزار کەسم لەژێر دەستدایە هەموویان ئیش و کار دەکەن و بەوێنەی منن ، ( پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت) : خزمەتکارەکەی دەڕوات لەپێش خۆیەوەو کۆشکێکی بۆ دەکاتەوە کە لە مرواری ناوبۆشە و دەرگاکانی و کلیلەکانیشی هەر هەمووی لە مرواریە و کۆشکێک لەبەردەمیدا دەبینێت لە گەوهەری سەوز دروستکراوە کە ناوەوەی سورە و حەفتا دەرگای تیایە هەموو دەرگایەک لەو دەرگایانە دەچێت بۆ کۆشکێکی تر و ڕەنگی هیچیان لەوی تر ناچێت ، لەهەر کۆشکێک لەو کۆشکانە هاوسەرو خزمەتگوزارو ڕاخەرو [بەنمونە وەک کورسی و قەنەفەو فەرش و هاوشێوەکانی ...هتد] و سیسەمی خەوی تێدایە ، کەمترینیشیان حۆریەکە حەفتا پۆشاکی [ئاوریشمی ناسکی تەنکی] لەبەردایە مۆخی ئێسکی هەردوو قاچی لەژێر ئەو هەموو پۆشاکەوە دەبینرێت ... پاشان پێی دەوترێت بەرزبەرەوە ، ئەویش لەکۆشکەکەیەوە بەرزدەبێتەوە و پێی دەوترێت : موڵکی تۆ ماوەی ڕێ ڕۆیشتنی سەد ١٠٠ ساڵە و چاوی خۆت هەمووی دەبینێت ).

(( ئیمامی عمر خوای گەورە لێی رازی بێت فەرمووی : ئەی کەعب ئایا گوێت لێ نیە کوڕی ئوم عەبد (مەبەست لە ابن مسعودە) چیمان بۆ باس دەکات لەبارەی کەمترین پلەی خەڵکی بەهەشت ئەی دەبێ پلەبەرزەکانیان خوای گەورە چییان پێ ببەخشێت ....))

بۆیە حەسەنی بەصری ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێت : ژیانی خۆش بۆ هەموو کەسێک تەنها لەبەهەشتدایە .

## سەرنجدان لە خاڵێك دەربارەی تەماعی مرۆڤ !



تۆ ئەمەت زانیوە ؟ تەماعی مرۆڤ ئەوەستێ ! مرۆڤ تەماعكارە واتە هەرچەندی هەبێت داوای زیاتر دەكات هەرگیز ناگاتە تێربوون . بەڵام لە بەهەشتدا نزمترین پلەو كەسی ناوبەهەشت كاتێک داوا لەپەروەردگار دەكات مەملەكەتی بەهەشتی پێ ببەخشێت خوای گەورە تا ١٠ ئەوەنەی هەموو فراوانی زەوی تەختی گەورەو جێگیری پێ دەبەخشێت كە هێندەی فراوانی ئاسمانە !

لێرەدا سنوری تەماعی ئەو كەسە ئەوەستێت و لە پێنجەم جاردا دەڵێ پەروەردگار بەسە ڕازیم بەوەنە و زیاترم ناوێ

واتە لەو جارەیدا كە خوای گەورە دەفەرموێ هاوشێوەی پێنج ئەوەنەی هەموو موڵكی سەر زەوی دنیا بۆتۆ ئیتر سنوری تەماعی مرۆڤەكە لەویدا كۆتایی پێ دێت و بەخوای گەورە دەڵێت پەروەردگار تەواو ڕازیم بەوەندە

بەڵام خوای گەورە بەڕەحمی خۆی بۆی دەكات بە هاوشێوەی ١٠ ئەوەندەی هەموو موڵكی سەر زەوی

كە زەوی تەختەو فراوانیەكەی هێندەی فراوانی ئاسمانەكانە واتە وەكو چۆن ناتوانین بگەین بە كۆتایی ئاسمان بەهەمان شێوە ناتوانین بگەینە كۆتایی زەوی تەخت و جێگیر وە زیندەوەران تەنها لەناو خانەیەكی بچوكی ئەم زەوییە فراوان و گەورەیەدا دەژین



ئەو نیشتیمانانەی ناو بەهەشتیش خوای گەورە خۆی دروستی کردوون بە زانستی ناکۆتاو گەورەی خۆی ، تۆ سەیری ئەم وێنانە بکە ئەمە مرۆڤانێک نەخشەیان کێشاوە کە خوای گەورە عیلمێکی زۆر کەمی پێداون و بەوشێوە جوانە دروستیان کردووە ! ئەی ئەبێ بەدیهێنەری ئاسمانەکان وزەوی ئەو نیشتیمانە گەورانەی ناو بەهەشتی بەچ جوانی و پێشکەوتوویی و ڕازاواییەک بونیاد نابێ بەزانستی بێ کۆتایی خۆی !!!



لەڕۆژی قیامەتدا کە بێ باوەڕەکان دەبینن خواپەرستە موەحیدەکان ئەم مەملەکەتانەیان پێ دەبەخشرێ گاز لەدەستی خۆیان دەگرن و پەشیمانی دەچێژن کەدادیان نادات چونکە لە دونیادا شوێنی نێردراوانی پەروەردگار نەکەوتن



## چەند دیمەنێکی جیاواز و تایبەت لەناو بەهەشتدا لەوانە :

### ١/ ئایا لەناو بەهەشتدا پەشیمانی هەیە ؟

(( هەر کۆمەڵێک لە هەر کۆڕێکدا دانیشتبن و یادی خوایان تێدا نەکردبێت و سەڵاواتیان لەسەر پێغەمبەر ﷺ نەدابێت ، ئەو دانیشتنەیان دەبێت بەداخ و پەشیمانی بۆیان لەڕۆژی کۆتاییدا هەرچەندە بخرێنە بەهەشتیشتەوە بە کردەوەکانی خۆیان )).

بێگومان ئایا دەبێ لەو مەجلیس و دانیشتنانە گەورەترو خێرتر هەبێت کە باسی گەورەیی و تاک و تەنهایی پەروەرێنی تیادا دەکرێت ! ، ئەبێ لەو کۆڕو کۆبوونەوانە بەچێژتر هەبێت کە باسی زانستی خوای گەورەو دەستورو یاساو شەریعەتەکەی تێدا دەکرێت و بۆ خەڵکان ڕووندەکرێتەوە ؟ ئەبێ لەو دانیشتنانە خۆشتر هەبێت کە تیایدا باسی پێغەمبەران علیهم السلام و ڕووداوەکانی ژیانیان دەکرێت وە بەتایبەتی باسی ژیانی پێغەمبەری خۆمان ﷺ ؟

بێگومان نیە بەڵکو ئەو ئەو کۆڕوکۆبوونەوانە ئەبێتە پلەبەرزی و لێخۆشبوون و سەربەرزی و گەیشتن بە نیشتیمانەکانی بەهەشت وە بەهۆی ئەو کۆڕو کۆبوونەوانەوەیە کە تۆ ئیمانت بەهێز دەبێت ، زانستی شەرعیت زیاد دەکات ، تەقوات زۆر دەکات ، بەمانەش کردەوەی چاک و عیابەدەتەکانت زۆر دەکەیت و پلە گەورەوگرنگەکانی بەهەشت بەدەست دەهێنیت .

هەر بەهۆی ئەو دانیشتن و مەجلیسە زیکرانەیە کە تۆ خەبەر دەکەنەوە لە خەوی غەفڵەت و بێ ئاگایی لە واقعی قیامەت و مەملەکەتەکان و نیشتیمانەکانی ناو بەهەشتەکان ... هتد

بۆیە تا دەتوانی بەشداربە لە هەر مەجلیسێک کە باس و خواسی زانستەکانی پەروەردگارو شەریعەت و ژیاننامەی پێغەمبەرەکانی تیادا باس دەکرێت علیهم السلام

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی ( گەر تێپەڕین بەلای باخچەکانی بەهەشتدا بەش و خۆشی خۆتان وەربگرن ، وتیان باخچەکانی بەهەشت چیە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (کۆڕی زیکرکردنە ) . واتە ئەو مەجلیس و دانیشتنانەی باسی دینی خوای گەورەی تیادەکرێت . هەر لەبەرئەوەیە کاتێک لە مەجلیسێکی دینیدا دادەنیشیت هەست بە ئارامی و دڵنیایی و چێژو خۆشیەک دەکەیت وەک چێژو خۆشی بەهەشت خۆت دەبینیتەوە لەهەندێ شت لە دونیادا .

## ٢/ تەماشای ئەم دیمەنە بکەن ؟

ئێستا تۆ ئەگەر کەسێکی مولتەزیم بیت واتە لەدڵ و ناختدا لەسەر قورئان و سونەت بیت و لە زاهیریشدا وەک پێغەمبەران و بەرنامەو شەریعەتەکانیان بیت ئەوا رووبەرووی چەندین گاڵتەجاری و ئیستیهزازو تانەو توانج ... دەبیتەوە

بەنمونە ئەگەر گەنجێکی مولتەزیم بیت و ئەهلی نوێژو رۆژوو و تەقواو مزگەوت و دین بیت وە ریشت لەسەر سونەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هێشتبێتەوەو پۆشاکەکەت بەوشێوەیە بێت کە لە دینی



ئیسلامدا ئیشارەتی پێدراوەو دەم بەسیواک بیت ئەوا گومانت نەبێ کە رووبەرووی چەندین سوکایەتی و تانەو تەشەرو توانج دەبیتەوەو گاڵتەت پێ دەکرێت لەلایەن مونافیق و بێدینەکانەوە ... هتد

بەنمونە ئەگەر تۆ ئافرەتێکی مولتەزیم بەدین بیت و خۆت باڵاپۆش کردبێ و خۆت داپۆشی بێت بەگوێرەی ئەو فەرمان و ئەمرەی کە خوای گەورە لە قورئان و سونەتی پێغەمبەرەکەیدا بڕیاری لەسەرداوە ئەوا گومانت نەبێ کە رووبەرووی چەندین تانەوتەشەرو تەعلیق و ئازاردانی دڵ و دەروونت دەکرێیتەوە ئەکەویتە بەر تەوژمی سوکایەتی و وتەی ناخۆش و ئازاردەر ... هتد

ئەگەر تۆ کەسێکی دامەزراو و مولتەزیم بوویت لەسەر ئیسلامەکەت و بێدینان و مونافیق و بێباوەڕەکان شەو و رۆژیان خستبووە سەریەک بۆ دوورخستنەوەو بێ دینکردنت بە ستەم و زۆڵم و زۆرداریکردن ... هتد

ئەگەر تۆ یەکێک بوویت لەوانەی کە بێدین و مونافیقەکان گاڵتەیان بە ئیسلامەکەت و بیروباوەڕەکەت ئەهات و ئەیانوت درۆیەو زیندووبوونەوە نیەو بەهەشت نیەو قیامەت نیەو لەسەر ئەمانە سوکایەتیان پێ ئەکردیت ... هتد

ئەگەر تۆ کەسێکی مولتەزیم و دەست بەدین و سیواکەوە بیت و لەغەیری بەرنامەی ئیسلامەکەی پەروەردگار خۆت نەدابێتە پاڵ هیچ گروپ و لایەن و بیروباوەڕێکی تر تەنها خۆت بۆ ئیسلام و حوکمەکانی قورئان و سونەت یەکلا کردبێتەوە ... ئەگەر لەسەر ئەم بۆخوابوون و تەوحیدەت رووبەرووی سوکایەتی و لێدان

و گرتن و کوشتن و ئازاردان ... بوویتەوە وە گاڵتەجاری و سوکایەتیان پێدەکردیت و پێت پێدەکەنین ... هتد

ئایا لەبەهەشتدا لەدەرەنجامی ئەمانەدا پەروەردگار چ دیمەنێکت پێ دەبەخشێت ؟

لەناو بەهەشتدا بەهەشتیەکان هەر یەکێکیان بویت لە دۆزەخیەکان کە لەدونیادا سوکایەتی و لێدان و تانەوتەشەرو توانجیان لێ داون و پێیان پێکەنیون وە توشی گرتن و تەعذیب و کوشتن کراونەتەوە ئەوا ئەو کەسانەیان نیشان دەدرێت کە چۆن دەسوتێنرێن و تەعزیب دەدرێن ئەمانیش (واتە بەهەشتیەکان) پێیان پێ دەکەنن وەک چۆن ئەوان لەدونیادا بەمان پێدەکەنین .

خوای گەورە لە سورەتی المطففین ئایەتی ٣٤-٣٥ دەفەرموویێت : { خەڵکی بەهەشت بانگ لە خەڵکی دۆزەخ دەکەن و پێیان دەڵێن : ئێمە ئەوەمان دەست کەوت و بینیمانەوە کە خوای گەورە بەڵێنی پێدابووین [واتە گەیشتین بە نیعمەتەکانی ناو بەهەشت] ئایا ئێوە هیچتان بینی لەوەی کە خوا بەڵێنی پێدابوون ؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ [واتە ئەوانیش گەیشتن بە سجن و ئاگرو سزاو عەزابەکانی ناو جەهەنەم].

**تێبینی/** (واتە بانگەوازکارەکە لەنێوان بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان لەو ساتەداو لەدوای ئەم گفتوگۆیەی بەهەشتیەکان و دۆزەخیەکان بانگەواز دەکات)



بانگەوازکارێک لەنێوانیاندا بانگەواز دەکات و دەڵێت لەعنەتی خوا لەو ستەم کارانە بێت کە پشت لە بانگەوازی خوا دەکەن و خەڵکانی لێ دووردەخەنەوە و ناشرینی دەکەن لە پێش چاوییان و باوەڕیان بەڕۆژی کۆتایی نیە }.

**تێبینی/** ئەهلی ئیمان و ئیسلام و بانگخوازو زاناکان ئەو زاڵم و ستەمکارانە بانگ دەکەن بۆ گەیشتن بەناو خۆشیەکانی مەملکەتەکانی بەهەشت بەڵام ئەمان لەبری ئەوەی بەدەم بانگەوازیەکەوە بچن دەبنە رێگر و ئەهلی ئیمان توشی گرتن و کوشتن و سوکایەتی دەکەن گاڵتەجاری بە پەیام و بەرنامەکەی خوای گەورە دەکەن و بەدرۆی دەخەنەوە بەوەشەوە ناوەستن دەکەونە شێواندن و ناشرینکردنی بەرنامەو دینەکەی پەروەردگار تا خەڵکانی لێ دووربخەنەوە وە بەوەشەوە ناوەستن چەندین کەسی دڵ و دەروون رەقی بێدین دەهێنن تا بەناوی دینەوە قسە لەسەر ئەم ئیسلامە بکەن تا لەژێر ناوی ئیسلامەوە ماناو مەبەستەکانی قورئان و سونەتی پێغەمبەران بگۆڕن و خەنجەری ژەهراوی خۆیانی لێ بدەن و خەڵکان لەو بانگەوازە پڕ لە رەحمەت و بەرەکەتە دووربخەنەوەو وەک خۆیان کافرو بێدینو مونافیقیان بکەن و تا ئەوانیش مەملەکەتەکانی بەهەشت بەدەست نەهێنن ... هتد

بەراستی ئەو زاڵم و ستەمکارو بێدین و مونافیقانە شایەنی ئەوەن کە لە رۆژی قیامەتدا بەهەشتیەکان بیانبینن و پێیان پێ بکەنن کاتێک لەناو جەهەنەمدا ئەسوتێنرێن و تەعذیب دەدرێن چونکە ئەوان لەم دونیایەدا تەعذیبی مسوڵمانان و بانگخوازانانیان



دەداو سوکایەتیان پێ دەکردن . پێکەنینیان بە باوەڕداران دەهات کە ئاگاداریان دەکردنەوە لە سوتان و جەهەنەم و عەزابی خوای گەورە بگرە بەدرۆو خوارافاتیان دەزانی، هەر لەبەرئەوەشە ئەهلی بەهەشت بەم جەهەنەمیانە دەڵێن ئایا گەیشتن بەوەی کە خوا وەعدی پێدابوون ئەوانیش دەڵێن بەراستی گەیشتن بەو سوتان و سزایە کە باوەڕمان پێی نەبوو وە بەدرۆمان دەزانی .... ئا ئەوە خەسارەتی گەورەیە .

## ٣/ دیمەنێکی جیاوازتر لەناو بەهەشتدا

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت { هیچ کەس ناچێتە بەهەشتەوە تاوەکو جێگەی خۆی پێ نیشان نەدرێت لەناو دۆزەخ گەر خراپکار بووایە ، بۆئەوەی زیاتر سوپاسی خوا بکات ، وە هیچ کەسیش ناچێتە ناو ئاگرەوە هەتا جێی خۆی پێ نیشان نەدرێت لەناو بەهەشتدا گەر چاکەکار بووایە ، بۆئەوەی ببێتە داخ و ناڕەحەتی بۆی ))

لەفەرموودەیەکی تردا (( هەموو دۆزەخیەک جێگەی خۆی پێ نیشان دەدرێت لەناو بەهەشتدا و دەڵێت : ئەگەر من خوای گەورە ڕێنموی بکردمایە ئەوە جێگەم دەبوو ئەو دیمەنەش دەبێتە داخ و پەشیمانی بۆی . وە هەموو بەهەشتیەکیش جێگەی خۆی پێ نیشان دەدرێت لەناو ئاگردا و دەڵێت : گەر خوای گەورە ڕێنمونی نەکردمایە ئەوە جێگەم دەبوو ، ئەو دیمەنەش دەبێتە ئەوەی زیاتر سوپاسی خوا بکات پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

**{أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ }**



واتە {نەوەکو یەکێک بڵێت : ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو هەموو لادانە لە فەرمانی خواو بەرنامەکەی بێ گومان لەو کەسانەش بووم کە گاڵتەم بە ئاین و بەرنامەی خوا دەکرد } .

**تێبینی/** مەبەست لە ئایەتەکە : واتە شوێن بەرنامەی ئیسلامی پەروەردگارتان بکەون و گوێڕایەڵی ببن و ببنە خواپەرستێکی تەواو بۆ خوای گەورە .

تەوبە بکەن لە تاوانەکانتان و بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارو تەسلیمی ئەوبن بۆئەوەی نەوەکو یەکێک لە ئێوە هەڵبگەڕێتەوە لە دینی خوای گەورەو بخرێتە ناو دۆزەخەوەو بەخۆی بڵێت : ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو هەموو لادانە لە فەرمانی خواو بەرنامەکەی بێ گومان لەو کەسانەش بووم کە گاڵتەم بە ئاین و بەرنامەی خوا دەکرد } . وە دڵنیاش بە لەو داخ و حەسرەت و پەشیمانیە هیچ سودێکی نابێت تەنها هەمووی ئەبێتە خەم و خەفەت و حەسرەت .

### ٤/ ئایا شتانێک هەن کە هی ناوبەهەشت بووبن و هێنرابێتنە سەر زەوی ؟

وەڵام / بەڵێ

**١/** خوای گەورە کاتێ ئادەمی لە بەهەشتەوە دابەزاندە دونیا دروستکردنی هەموو شتێکی فێرکرد ، وە بەروبوومی بەهەشتی پێ بەخشی بەڵام بەروبوومەکانی دونیا دەگۆڕێت و ئەوانەی ناو بەهەشت گۆڕانی بەسەردا نایەت ) واتە هیچ شتێک لەبەهەشتدا نیە لە شتی دونیا بچێت تەنها ناوەکانی نەبێت [ واتە تەنها ناوەکانیان وەک یەکە ]

**٢/** هەندێ شتی بەهەشت لەدونیادا هەیە لەوانە (خورمای عەجوە، بەردە ڕەشەکە ، مەقامی ئیبراهیم ، مەڕ و بەران و شەک لە ئاژەڵەکانی بەهەشتە )

خورمای عەجوە / خورمای عەجوە لە بەهەشتەوەیە شیفایە بۆ کەسێک کە توشی ژەهر بووبێت .

بەردە ڕەشەکە و مەقامی ئیبراهیم / لە بەردە یاقووتەکانی بەهەشتن لەوێوە دابەزێندراونەتە دونیا لەبەفر سپی تر بوون و خوای گەورە نورو ڕووناکی هەردووکیانی کوژاندۆتەوە ، گەر نورو روناکی هەردووکیانی نەکوژاندایەتەوە هەردوو نێوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایان ڕووناک دەکردەوە .

لەفەرموودەیەکی تردا / بەردە ڕەشەکەو مەقامی ئیبراهیم یاقوتی بەهەشتن گەر گوناهو تاوانی موشریکەکانی کوڕانی ئادەم بەری نەکەوتایە نێوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ڕووناک دەکردەوە و هەر کەسێک بۆ هەر نەخۆشیەک دەستی لێ بدایە چاک دەبووەوە .

## چۆن دەبیتە کەسێکی بەهەشتی ؟



سەرەتا بزانە کە خوای گەورە بەهەشتی بە نارەحەتیەکان و کردەوە قورسەکان دەورەداوە کە ( بەنارەحەتی خەڵک دەیگەنێ و دەچنە ناوی ) مەگەر خوای گەورە ڕێگەکەیان بۆ ئاسان بکات:

١/ بزانە کە کلیلی بەهەشت نوێژە وە کلیلی نوێژیش دەست نوێژە

٢/ شمشێرەکان کلیلەکانی بەهەشتن واتە ئەوانەی جەنگ دەکەن و تێدەکۆشن بۆ سەرخستنی دینی خوای گەورە

٣/ بزانە کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان و ڕۆژووی ڕۆژانی دوو شەممان و پێنج شەممان زۆر گرنگن لەدەست خۆتی مەدە چونکە لەو کاتانەدا دەرگاکانی بەهەشت دەکرێتەوەو بانگکارێک بانگ دەکات و دەڵێت ئەی ئەو کەسانەی بەدوای چاکەدا دەگەڕێن ئەوا دەرگای بەهەشت کراوەتەوە بۆ چاکەکردن ، ئەی ئەو کەسانەی کە بەدوای خراپەدا وێڵن وازبهێنن و بگەڕێنەوە ...

٤/ بزانە ئامادەبوونت لەناو کۆڕی قورئان خوێندن و وانەو دەرسە ئاینیەکاندا وەک ئەوەیە لەناو باخچەکانی بەهەشتدابیت ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ (گەر تێپەڕین بەلای باخچەکانی بەهەشتدا بەش و خۆشی خۆتان وەربگرن ، وتیان باخچەکانی بەهەشت چیە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی کۆڕی باسەکانی یادی پەروەردگارو دینەکەیەتی )

/٥ بەسەردانی کردنی تۆ بۆلای برایەکی مسوڵمانت کە نەخۆشە وەک ئەوە وایە کە لەسەر ڕێگەیەکی بەهەشتدا گوزەرت کردبێت تاکو دەڕۆیت و دەشگەڕێیتەوە ، هەروەها ئەگەر لەبەرە بەیاندا سەردانت کردبێ ئەوا حەفتا هەزار فریشتە دوعای خێرت بۆ دەکەن تاکو ئێوارە ، وە ئەگەر لە ئێوارەدا سەردانت کردبێ ئەوا حەفتا هەزار فریشتە دوعای خێرت بۆ دەکەن تاکو بەیانی ، وە دەبیتە خاوەنی باخچەیەک لە باخچەکانی بەهەشت .

/٦ ئەگەر تۆ لەکاتی بەجێهێنانی عومرەدا خوای گەورە بەنسیبی کردیت لەنێوان مینبەرەکەی پێغەمبەری خوا و ژوورەکەیدا نوێژت ئەنجامدا ئەوا وەک ئەوەیە کە لەناو باخچەیەک لە باخەکانی بەهەشت نوێژت کردبێ چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ نێوانی مینبەرەکەم و ژوورەکەم باخێکە لە باخەکانی ناو بەهەشت ، وە پێچەکانی ئەم مینبەرەی من پلەن لە بەهەشتدا ، مینبەرەکەشم لەسەر بەرزاییەکە لە بەرزاییەکانی بەهەشت .

/٧ بە خزمەتکردنی تۆ بۆ دایکت وەک ئەوەیە لەناو بەهەشتدا بیت چونکە بەهەشت لای قاچەکانی دایکەوەیە ، وە باوکیشت دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت

/٨ تۆ دەبیتە خاوەنی بەهەشت بەهەمیشەیی تیایدا دەمێنیتەوە ئەگەر باوەڕت بەتاک و تەنهایی پەروەردگار هێنابێت وە هیچ شەریک و هاوتایەکت بۆ بڕیارنەدابێت لەغەیری ئەو داواو دوعاو پاڕانەوەت لە شەخس و داروبەردو گۆڕو کەسی تر نەکردبێت ، لەغەیری بەرنامەو ئیسلامەکەی ئەو خۆت نەلکاندبێ بەهیچ



بەرنامەو فکرو ئایدیایەکی ترەوە بە تەنها شوێنی ئیسلامەکەی پەروەردگار کەوتبێ

٩/ ئەوپەڕی پلەی ئیمان و تەقوا ئەگەر تۆ وەک ئەو کەسانە بیت کە پەروەردگار لەم ئایەتەدا وەسفیان دەکات

{تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (١٦) فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ }

لاشەکانیان لە خۆشی و گەرمی جێی نوستنەکانیان دائەبڕن و ڕادەپەڕێن ، بۆچی ؟

لە باوەشی گەرم و خۆشی هاوژینەکانیان لەو نیوەی شەوەدا لە شیرینی خەودا رائەپەڕێن دووردەکەونەوە ، بۆچی ؟

چونکە دڵەکانیان لەگەورەیی ئیمان و تەقوای الله جل جلاله خورپەی پێدا دێت و خەبەریان دەکاتەوە یەکسەر لەسەرمای زستاندا دەستنوێژ دەگرن و دێن بەسوجدەداو شەونوێژ ئەنجام دەدەن وە دوعا دەکەن و دەستەکانیان بەرزدەکەنەوە

داوا لە پەروەردگاریان دەکەن بەترس و لەرزەوە بەوپەڕی هیواو رەحمی خواوە لە ترسی گەورەیی قیامەت و دۆزەخ داوا دەکەن پەروەردگار لێیان خۆش بێت و پاشان نیشتمانەکانی بەهەشتیان پێ ببەخشێ

هەر لەپێناوی الله دا ئەو رزقەی کە خوا پێی بەخشیون دەیبەخشنەوە بە هەژاران و بێ نەوایان لە مسوڵمانان ئەو نەفسانە (ئەو جۆرە خەڵکانە) نازانن و ناتوانن تەسەوڕی گەورەیی ئەو پاداشتە بکەن کە چیان لە هەدێ و مەملەکەت و نیشتیمانی ناو بەهەشت بۆ شاردراوەتەوەو دابینکراوە ئەوانە کاتێک پێی دەگەن چاوەکانیان گەش دەبن لە گەورەیی و جوانی و خۆشی ئەو نیعمەتانە کە پێیان دەبەخشرێت ئەو پاداشتە گەورەیە بەهۆی ئەو کارانەوە پێیان بەخشرا کە ئەنجامیان دابوو

یارب بمانگەیەنیتە ئەم پلەیە

١٠/ ئەگەر تۆ بەتەواوی ئارامت گرت وە بە ئیخلاسی و دڵسۆزی بە تەنهاو دوور لە هەموو کەس و شتێک پشتت بە پەروەردگارت بەست دوای (باوەڕهێنان و کردەوە چاکەو خێرەکان کە ئەنجامت دابوون ) ئەوا بەهەمیشەیی دەخرێیتە ناو بەهەشتانێکەوە کە رووبارە گەورەکان بەژێریاندا دەڕوات

١١/ ئەگەر تۆ بەجدی دەستت بە ئیسلامەکەتەوە گرت و بوویتە کەسێکی مولتەزیم و بەتەنها بۆ دینەکەی پەروەردگار یەکلابوویتەوەو ئیسپاتت کردو وتت کە تەنها الله پەروەردگارمە پاشان بەردەوامی و ئیستیقامەت دا بەم ئیلتیزام و دینداریەتەوە ئەوا لە قیامەتدا هیچ ترس و حوزنێکت توش نابێت و دەبیتە خاوەنی هەمیشەیی نیشتمانەکانی ناو بەهەشت وە دەبێتە پاداشت بۆت بەو بەردەمی و دەستگرتنەت بە دینەوە .

١٢/ تۆ ئەگەر كەسێك بوویت كاتێك نارەحەتی و كێشەیەك یان كارێكت بۆ هاتە پێشەوە ، گەڕایتەوە بۆلای خوای گەورەو داوات لەو كرد بۆ لاچوونی نارەحەتیەكە یان بۆ جێبەجێ بوونی كارەكەت ، یان پرسیارت بۆ هەر شت و بابەتێك بۆ دروست بوو یان حوكمت گەڕاندەوە بۆ پەروەردگار و گەڕایتەوە بۆ قورئانەكەی خوای گەورەو سونەتی پێغەمبەرەكەی ، وە ملكەچ و دڵ ئارام بوویت بە حوكم وبڕیارو فەرمانەكەی پەروەردگارت ، دڵنیابە تۆ نیشتەجێی بەهەشتی بۆ هەتاهەتایی . واتە ئەگەر تۆ بۆ هەموو شتێك و داوایەك بگەڕێیتەوە بۆلای خوای گەورە .

١٣/ ئەگەر تۆ حەرامێك و تاوانێك هات بەڕووتەوەو كەست لێ دیار نەبوو بەڵام لە ترس و شەرم و مەقام و شكۆی پەروەردگارت ئەو تاوانە یاخود ئەو حەرامەت ئەنجام نەدا هەستت بە گەورەیی الله تعالی كرد ئەوا بەتایبەت دوو باخ و باخاتی ناو بەهەشتت بۆ هەیە .

١٤/ ئەگەر تۆ كەسێك بوویت زۆر بەزانستیانەو وە بە ئازایانەو بەجورئەت و بە حیكمەتەوە دژی دوژمانی پەروەردگارو پێغەمبەرەكانی وەستایتەوە و خۆشت نەویستن و ڕقت لە كاروكردەوە پڕ لە كوفرو بێدینیەكەیان بوو وە دیفاعت لە دینی خوای گەورە ئەكرد ئەگەرچی ئەو دوژمنە باوكت بێ یاخود نەوەو منداڵەكانت بن یان براكانت بن یاخود هۆزو خێڵ و عەشیرەتەكەت بن ئەوا پەروەردگار ئیمانی لەناو دڵتدا جێگیرو مۆر كردووەو ، وە پشتگیریت دەكات و سەرتدەخات لەلایەن خۆیەوە ، وە بەهەشتانێك و نیشتمانانێكت پێ دەبەخشێ كە

رووبارەکان بەژێریاندا دەڕۆن و بەهەتاهەتایی تیایاندا دەمێنیتەوە ، وە پەروەردگار لێت خۆش دەبێت و لێت رازی دەبێت و تۆش لە پەروەردگاری خۆت رازی دەبیت ، تۆ ئەبیتە یەکێک لە باوەڕدارەکانی حیزبەکەی پەروەردگار (دوور لە هەموو حیزب و گروپ و لایەن و دین و ئەفکارێک) ، ئایا کەس هەیە براوەتر بێت لەو کەسەی کە بەتەنها سەر بەحیزب و بەرنامەو دینەکەی پەروەردگارە !؟ واتە بەتەنها سەر بە ئیسلامەکەی پەروەردگارە !؟

**١٥/** تۆ ئەگەر یەکێک بوویت لەو کەسانەی دەتبەخشی لەو رۆزی و رزقەی کە پێت بەخشرابوو لەلایەن پەروەردگارەوە

بەتەنها لە پێناو رەزامەندی پەروەردگاردا دەتبەخشی بەنهێنی و ئاشکرا بەجوانترین شێوە دوور لە منەت و هەڵەو خراپەکاری ، ئەوا سەرەنجامت نیشتیمانە رازاوەکانی ناو بەهەشتەکانە

**١٦/** ئەگەر تۆ کەسێک بوویت کە

* نوێژەکانت کە ئەنجامی دەدەیت بە خشوعەوە بێت

* ئەگەر بەرهەڵستیت کرد لە قسەوباسی درۆو ناراست و لەغو لعب و گاڵتەجاڕی و شتی بێ سود

* ئەگەر تۆ کەسێک بوویت بە رێک و پێکی و دوور لە منەتکردن زەکاتی ماڵەکەت دەردەکرد

* ئەگەر تۆ کەسێک بوویت داوێنی خۆتت پاراست لە تاوان و زینا لەغەیری هاوسەرەکانی (هاوسەرو کەنیزەک)ی خۆت کە لۆمەت

لەسەر نیە بۆ ئەوان (گەر لەغەیری ئەوانە داوێنت نەپاراست ئەوا سنورت بەزاندووە)

* ئەگەر تۆ یەکێک بوویت لەوانەی کە نوێژەکانت پاراست و بە ڕێک و پێکی و لەکاتەکانی خۆیدا وە بەخشوعەوە ئەنجامتدا

* ئەوا تۆ دەبیتە وارسی (جێگرەوەی بەهەشتەکانی فیردەوس) و بەهەتاهەتایی تیایاندا دەمێنیتەوە

## ئەو کەسانە کێن کە دەچنە بەهەشتەوە ؟

پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام بۆمان باس دەکات

١/ هەژارەکانن :

(ئەو هەژارەی کە زۆر بەقەناعەتەو رازیە وە زۆر خۆ بەکەم زانە واتە تەکەبوری نیە) هێندە دڵ پاک و موتەقیە بەجۆرێک ئەگەر سوێند لە پەروەردگار بخوات بۆ هەر شتێک ئەوا خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەکات ، (خەڵکی بەهەشت هەموو لاوازو بێ دەستەڵات و چەوساوەکانن)

٢/ خەڵکی بەهەشت سێ جۆر کەسن :

- کاربەدەستێکی دادپەروەردی کارئاسان

- پیاوێکی بەبەزەیی و دڵ نەرم بۆ هەموو خزم و دۆستێکی نزیک و برایەکی مسوڵمانی

- وە هەژارێکی داوانەکەرو بەخشندە .



٣/ پێغەمبەران و شەهیدان و ڕاستگۆیان لەبەهەشتدان ، منداڵە کۆرپەلەکان لەبەهەشتدان وە ئەو منداڵانەش کە زیندە بەچاڵ کراون لەبەهەشتدان ، وە هەر پیاوێک سەردانی برایەکی مسوڵمانی بکات لەجێیەکی دوورەوە لەبەرخوا ئەویش لەبەهەشتدایە

٤/ خەڵکی بەهەشت ئەو کەسانەن کە خوای گەورە هەردوو گوێیانی پڕکردووە لە باسی چاکەی خۆیان کە خەڵکان باسیان بەچاکە دەکەن ، وە خەڵکی دۆزەخیش ئەو کەسانەن کە خوای گەورە گوێیانی پڕکردووە لەباسی خراپەی خۆیان کە خەڵکان باسیان بەخراپە دەکەن .

تێبینی/ بزانە بەکردەوەکانت و وتەکانت چۆن لەناو خەڵکاندا ناسراویت بەچاکە یان بەخراپە !؟

هەر مسوڵمانێک (چوار کەس یاخود سێ کەس یاخود دوو کەسیش) شاهیدی خێرو چاکەی بۆ بدەن خوای گەورە دەیکاتە ناو بەهەشتەوە .

٥/ ئافرەتانی بەهەشت کامانەن ؟ پێغەمبەری خوا دەفەرموویێت:

((ئەو ئافرەتەیە کە پێنج فەرزەی نوێژەکانی کرد ، مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بوو ، داوێنی خۆی پاراست و گوێڕایەڵی مێردەکەی کرد ئەوە لەهەر دەرگایەکی بەهەشتەوە ویستی لێبێت دەچێتە ناوییەوە ))

(( ئەو ئافرەتانەن کە مێردەکانی خۆیان زۆر خۆش دەوێت و منداڵانی خۆیان جوان پەروەردە دەکەن و مێردەکانیان ڕازی دەکەن و گەر مێردەکانیشیان زوڵمیان لێ بکەن ، ئەوان دەڵێن :

ئا ئەوە دەستم لەناو دەستتدایە ناخەوم و نان ناخۆم تا لێم ڕازی نەبیت ))

برای بەڕێزو خوشکی ئازیزم بزانن کە هیچ شتێک نەماوە نزیکمان بکاتەوە لەبەهەشت و وە دوورمان بخاتەوە لە دۆزەخ ئیلا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی روون کردووینەتەوە.

هەموو کارو کردەوەکانی بۆ باسکردووین لە فەرمانکردن بەچاکەو وە هەروەها لە نەهیکردن و قەدەغەکردنی خراپە کە پێی بچینە ناو بەهەشتەوەو رزگارمان بکات لە دۆزەخ .

وە گومانتان نەبێت کەسمان بەکردەوەی خۆمان ناچینە ناو بەهەشتەوە بەڵکو بەسۆزو لێخۆشبوون و رەحمی پەروەردگار تەنانەت خودی پێغەمبەری خواش ﷺ .

بۆیە ڕزگاربوون لە ئاگر بەلێبوردنی خوای گەورەیەو چوونە بەهەشت بەسۆزو بەزەیی خوایە جل جلالە ، بەڵام کەسەکە کە چووە بەهەشتەوە پلەو پایەی لەناو بەهەشتدا بەگوێرەی کرداری خۆی دەبێت کە لەژیانی دونیادا ئەنجامی داوە .

## جوانترین پێشوازی



یەکەم سات کە پێشوازیتان لێ دەکرێ بۆناو مەملەکەت و نیشتیمانەکانی بەهەشت پێتان دەوترێ

سڵاوی پەروەردگارتان لێبێ ، ئێوە پاک و بێگەرد بوون بەتەواوی خۆتان پاراست لە شوێنکەوتن بۆ غەیری پەروەردگار، فەرموون بۆناو بەهەشتی پڕ لە خۆشی و پڕ لە نیعمەتی هەتا هەتایی

دوای ئەوە دەعوەتێکی تایبەت دەکرێن لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ خۆشترین خوان و خواردنی ناو بەهەشت

تێبینی/ سیفەتی ئەم بەهەشتیانە ئەوەبووە کە شوێن هیچ گروپ و لایەن و بەرنامەو دین و ئەفکارێک نەکەوتوون وە خوای پەروەردگاریان بە تەنها پەرستووەو لەگەڵیا هانایان بۆ پیاوچاکان و پێغەمبەران نەبردووەو هاواریان لێ نەکردوون ، ئەمانە تەنها پیاوی خوا بوون.



## ئەگەر ئەم کردەوانە ئەنجام بدەیت مەملەکەتەکان بەدەست دەهێنی :



**یەکەم / تەوحید :** ئەگەر هەر کەسێک شایەتی بدات بە تاک و تەنهایی پەروەردگار وە بە پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ پاشان هاوبەشی بۆ خوا بڕیار نەدابێت هەر لە (پەرستن ، دوعاکردن ، داوای شیفاکردن ، عیبادەت ، پاڕانەوە ، حوکم ...هتد ) ئەوا دەخرێتە بەهەشتەوە ئەگەرچی تاوانی گەورەیشی هەبووبێت وەک زیناو دزیکردن.

**دووەم/ پایەکانی ئیسلام:** پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەفەرمووێ: ئیسلام لە سەر پێنج پایە دامەزراوە :-

١- شهادة ان لا اله الا الله وان محمدا رسول الله : ( شاهیدی دان بەوەی هیچ پەرستراوێک نیە بە حەق تەنها - الله - ، وە محمد نێردراوی خوایە - لەسەرمانە گوێ ڕایەڵی بکەین - ).

٢- واقام الصلاة : ( ئەنجام دانی نوێژەکان (فەرزو سونەت) بە هەموو پایەو واجبەکانی بە خشوع ).

٣- وايتاء الزكاة : وە زەکات دان ( واجب دەبێ زەکات ئەگەر موسڵمان ببێتە خاوەنی ٨٥ گرام زێڕ یان ٥٩٥ غرام زیو یان پارە بە قەد ئەو زیوە لەسەریەتی لە سەدا دوو و نیو دەربکا لە پاش تێپەڕبونی ساڵێک بەسەر ئەوماڵەی وە غەیری پارەش هەر شتەو پێوەری دیاری خۆی هەیە لە شەرع ).



٤- وحج البيت : ( وە سەردانی ماڵی خوا - فەرزە یەک جار لە تەمەنت ئەگەر توانات هەبێ - ).

٥- وصوم رمضان : ( وە ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان - واز هێنان لە خواردن و خواردنەوە و جیماع کردن و هەموو ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن لە کاتی دەرچونی فەجر تاکو ئاوا بونی ڕۆژ لە گەڵ هەبونی نیەتی خواپەرستی لە دڵدا - ) - متفق عليه -.

**سێیەم/ پایەکانی ئیمان :** پێغەمبەر (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) ئەفەرموێ :-

١- ( ان تؤمن بالله ) باوەڕ بێنی بە خوا - بەیەک کردنی خوایە لە زاتی و لە سیفەتەکانی و لە پەرستندا -.

٢- ( وملائكته ) وە باوەڕهێنان بە فریشتەکانی - دروست کراون لە ڕوناکی بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا .

٣- ( وكتبه ) وە باوەڕهێنان بە کتێبەکانی - تەورات و ئینجیل و زەبور وە قورئان کە چاکترینیانە و ئەوانەی پێش خۆی نەسخ کردۆتەوە .

٤- ( ورسله ) وە باوەڕهێنان بە پێغەمبەرەکانی – یەکەمیان ئادەم و دواهەمینیان(محمد)ە عليهم الصلاة والسلام .

٥- ( واليوم الاخر ) وە باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی – ڕۆژی زیندوو بونەوەیە بۆ لێپرسینەوەی خەڵک لە سەر کردەوەکانیان .



٦- ( وتؤمن بالقدر خيره وشره ) وە بڕوا بێنی بە قەدەر خێری و شەڕی – ڕازی بوون بە قەدەر بە خێری و بە شەڕی لە گەڵ بەکار هێنانی هۆکارە شەرعیەکان –( متفق عليه ).

هەر کەسێک گوێرایەڵی پێغەمبەری خوا بکات ﷺ دەچێتە بەهەشتەوە وە هەر کەسێکیش سەرپێچی بکات ئەوا پشتی لێکردووەو دەچێتە دۆزەخەوە .

+ هەر کەسێک دوا قسەی وشەی لا اله الا الله بێت یاخود لە دڵیەوە بیڵێت دەچێتە بەهەشتەوە .

+ (( هەر کەسێک بڵێت ( لا اله الا الله و الله اكبر ... لا اله الا الله وحده لا شريك له ... له الملك و له الحمد ... لا اله الا الله و لاحول ولا قوة الا بالله ) وە دەفەرموویێت هەر کەسێک لە نەخۆشی سەرەمەرگدا ئەوە بڵێت و بمرێت ئاگر نایسوتێنێت )).

+ هەر کەسێک رازی بێت بەوەی خوا پەروەردگاری بێت وە ئیسلام دینی بێت وە محمد ﷺ پێغەمبەری بێت دەچێتە بەهەشتەوەو بەهەشتی بۆ واجب بووە .

+ هەر کەسێک خوا بپەرستێت و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدات ، نوێژە فەرزەکان ئەنجام بدات ، مانگی رەمەزان بەڕۆژوو ببێت حەڵاڵ بە حەڵاڵ بزانێت و حەرام بە حەرامیش بزانێت خۆی بەدوور بگرێت لە حەوت تاوانە گەورەکە ، ئەگەر ئەمانە بەڕێک و پێکی ئەنجام بدات دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوەو دەچێتە بەهەشتەوە .

+ هەر کەسێک لەبەرخوا چاکەو خێرێک بکات و لەسەر ئەو خێرە بمرێت ئەو کەسە خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە .

+ هەر کەسێک دوا کردەوەی خواردنێک بێت بیدات بە هەژار لە پێناوی خوادا و چاوەڕوانی پاداشتەکەی لای خوا بکات ئەو کەسە پەروەردگار دەیخاتە بەهەشتەوە ، وە هەر کەسێک کۆتایی کردەوەکانی بە بەڕۆژووبوونی ڕۆژێک بێت لە پێناوی خوادا دەچێتە بەهەشتەوە ، وە هەر کەسێک دوا وشەی (لا اله الا الله) بێت وە چاوەڕوانی پاداشتەکەی لەخوا کردبێت ئەو کەسە خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە .

+ هەر کەسێک سورەتی الاخلاص ی زۆر خۆش بوێت و بەبەردەوامی بیخوێنێت لە خۆشەویستی بۆ ئەو سورەتە پەروەردگار دەیخاتە بەهەشتەوە .

+ هەر کەسێک نەوەدو نۆ ٩٩ (ناو و سیفەتەکانی) پەروەردگار بژمێرێت و لێیان تێبگات و بیانخوێنێت کاریان پێ بکات دەچێتە ناو بەهەشتەوە .

+ هەر کەسێک پارێزگاری لە پێنج نوێژە فەرزەکەی بکات هەر لە رکوعەکانی و سوجدەکانی وکاتەکانی وە بزانێت ئەوانە حەقن لەلایەن خواوە پێویستکراون ( وە نەیان فەوتێنێت) ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە .

+ هەر کەسێک چل ٤٠ ڕۆژ نوێژە فەرزەکان بۆ خوا بە جەماعەت بکات و فریای (الله اکبر) ی یەکەم بکەوێت ئەو کەسە دوو رزگاربوونی بۆ هەیە یەکێکیان لە دووڕوویی و ئەوی تریان لە ئاگر .



## ئایا ئەزانی...

ئەو مەملەکەتانەی کە لەناو بەهەشتدان و بە کەسانی باوەڕداری بەتەنها خواپەرست دەبەخشرێ زۆر لەم شارەی ناو ئەم وێنەیە جوانترو سەرنج راکێشترو دڵڕفێنترە

تیاچوو فەوتاو ئەو کەسەیە کە نیشتیمانەکانی ناو بەهەشتی لەدەست دەچێت بەهۆی ئەوەی خۆی کافر و یاخی کردووە بە بیروباوەڕی مولحیدێکی نەزان و فاشیل و دۆڕاوی ناو فەیسبوکو سۆشیال میدیا

ئینجا بیهێنە پێش چاوی خۆت لەو گۆڕەپانەی قیامەتەدا راتبگرن و زۆر جوانتر و خۆشتر لەم مەملەکەتەی ناو وێنەکانت نیشان بدەن پێت بڵێن ئەمانە هەمووی موڵکی تۆ دەبوون ئەگەر خۆت بێدین و سەرەڕۆ نەکردایە

ئینجا وەرە لە رووت بێ لەناو ملیارەها مرۆڤدا لێت بپرسن لەبەرچی رەوانەی جەهەنەم کرایت تۆش رووی ئەوەت هەبێ بڵێی بەهۆی پۆستی فلان کەسی مولحیدەوە یاخی بووم لە ئیسلام و دینی خوای گەورە

لەو ڕۆژەدا کافرو بێدین و یاخی رجاو تکاو ئەکات کە بۆ یەک سات بیگەڕێننەوە بۆ دونیا تا باوەڕبهێنن بەڵام پەشیمانی هیچ دادێکی نادات و گەڕانەوە نیە ، پیرۆزت بێت بەهەتاهەتایی بۆ بەندینخانەو و ئاگرەکەی ناو جەهەنەم

تەماشای وێنەکە بکەن زۆر خۆش و جوان و سەرنج راکێشە



ئەگەر ئێستا

## ئەگەر ئێستا مردوویەك لە جیهانی بەرزەخەوە بگەڕێنیتەوە بۆ دونیا ، چی ڕوودەدات ؟

باوەڕکە ئەو نایەوێ بگەڕێتەوە بۆ ناو کەس وکارو عایلەکەی

باوەڕکە ناگەڕێتەوە بۆ تەواوکردنی ئەو کارانەی کە تەواوی نەکردبوون

باوەڕکە نایەوێ بگەڕێتەوە بۆ کەیف و سەفا و خۆشیەکانی دونیا

دڵنیابە کە ئەو بۆلای هیچ کەسێک و هیچ کارێکی دونیا ناگەڕێتەوە

بەڵکو بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە فریابکەوێت تەنها یەک جار بڵێ ( سبحان الله ) واتە (پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگار ) بۆچی ؟

چونکە ئەو مادام بەچاوی خۆی (بەچاوی بێ سنوری ڕۆحی) گەورەیی جیهانی بەرزەخی بینیوە ئینجا لە قیمەی تەوحیدی سبحان الله تێدەگات بۆیە کە یەک جار دەڵێ سبحان الله ئەوەی بۆکافیە کە سەرفرازی هەموو جیهانەکان و ژیانەکان بێت بەجۆرێک بگاتە خۆشەویستی اعلی و پاشان بردنەوە گەورەکە بەدەست بێنێت کە نیشتمانەکانی بەهەشتە

تا ڕۆحت تیایە بەو شێوەیە لە دڵێکی پاک و بێگەردەوە بڵێ سبحان الله ( پاک و بێگەردی بۆ پەروەرێنی جیهانەکان و ژیانە جیاوازەکان ) .

## ئەگەر ئەم کردەوانە ئەنجام بدەیت دەبێتە هۆکاری چوونە بەهەشت :



هەر کەسێک بەردەوام بێت لە ئەنجامدانی دوانزە ڕکات نوێژ لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا دەچێتە بەهەشتەوە ، ٤ چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ ، دوو ڕکات دوای نوێژی نیوەڕۆ دوو ڕکاتیش دوای نوێژی مەغریب ، دووانیش لەدوای نوێژی خەوتنان ، وە دوو ڕکاتیش پێش نوێژی بەیانی ...

هەرکەسێک پارێزگاری لە چوار ڕکات نوێژی پێش نیوەڕۆ ودوای نیوەڕۆ بکات ئەو کەسە خوای گەورە جەهەنەمی لەسەر حەرام دەکات

هەر کەسێک ئایەتی کورسی بخوێنێت لەدوای هەموو نوێژێکی فەرز هیچ شتێک ڕێگری چوونە بەهەشتی ناکات تەنها مردن نەبێت واتە کە مرد یەکسەر دەچێتە بەهەشت

مزگەوت ماڵی هەموو لەخوا ترسێکە ، خوای گەورە کەفیلی ئەو کەسەی کردووە کە مزگەوتی کردووە بەماڵی هەمیشەیی و بەردەوام هاتوچۆی دەکات بەوەی کە ڕەحمیان پێ بکات دڵ نەواییان بکات وە یارمەتیان بدات بۆ پەڕینەوە بەسەر پردی سیڕات بۆ ڕازی بوونی خواو چوونە ناو بەهەشتەوە .



هەر کەسێک دەستنوێژێک جوان بشوات و پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات بەدڵ و بە ڕوخسار ئاگای لە نوێژەکەی بێت ئەو کەسە بەهەشتی بۆ مسۆگەرە . (دوو ڕکاتی دوای دەست نوێژ).

لە عبدالله ی کوڕی بورەیدەوە رضي الله عنه ، ئەویش لە باوکیەوە دەفەرموویێت [ بەیانیەکیان پێغەمبەر ﷺ بیلالی بانگ کرد و پێی فەرموو : ئەی بیلال بە چ کردەوەیەک پێش من کەوتی بۆ بەهەشت ؟ من دوێنێ شەو چوومە ناو بەهەشت (واتە: لەخەودا) گوێم لە خشەخشی نەعلەکانت بوو لە پێشمەوە، بیلالیش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا هەرکاتێک بانگم داوە دوو ڕکات نوێژم کردووە و هەرکاتێک دەستنوێژم شکابێت یەکسەر دەستنوێژم شۆردووە و لەدوای دەستنوێژەکەوە دوو ڕکات نوێژم کردووە (وە من وای دەبینم لەسەرمە بۆ خوا دوو ڕکات نوێژ بکەم ) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ((کەواتە لەبەر ئا ئەوە بووە )) . ]

هەرکەسێک دوانزە ساڵ بانگ بدات ئەو کەسە بەهەشتی بۆ مسۆگەرە وە بۆ هەر بانگێک کە بانگ دەدات شەست چاکەی بۆ دەنوسرێت و بۆ هەر قامەتێکیش سی چاکەی بۆ دەنوسرێت .

خوای گەورە سەیری لێ دێت بۆ شوانی مەڕێک لەسەر لوتکەی شاخێکە بانگ دەدات و نوێژ دەکات و خوای گەورەش دەفەرموویێت: سەیری ئەو بەندەیەم بکەن بانگ دەدات و قامەت بۆ نوێژەکەی دەکات و لەمن دەترسێ ئەوا لەو بەندەیەم خۆش بووم و خستمە ناو بەهەشتەوە .

**تێبینی/** ئەم فەرموودەیە بەگشتی بۆ هەموو کەسێکە کە بەتەنیا بژێت لە هەر وڵات و ناوچەیەک بێت کە مزگەوتی لێوە دووربێت وە لەناو مسوڵمانانداا نەژی بەگشتی والله اعلم .

هەر کەسێک بەیەقین و ئیمانەوە لەدڵەوە بانگ دووبارە بکاتەوە لەدوای بانگ بێژ وەک خۆی وە تەنها لەکاتی (حي على الصلاة ، حي على الفلاح ) بڵێ (لاحول ولا قوة الا بالله ) وە باقی بانگەکە وەک خۆی دووبارە بکاتەوە دەچێتە بەهەشتەوە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ( دوو کردار هەیە هەر مسوڵمانێک پارێزگاری بکات ئەوا دەچێتە بەهەشت ، هەردوو ئاسانن ، ئەوانەی ئەنجامیان دەدەن کەمن ، لەدوای هەموو نوێژێک دە جار (سبحان الله ) وە دە جار (الحمدلله) وە دە جار (الله اكبر) بڵێت دەگاتە سەدو پەنجا بە زمان وە هەزارو پێنج سەدە لە تەرازووەکەیدا ، سی و چوار جاریش (الله اكبر) بڵێت کە چووە سەر جێگاوەو سی و سێ جاریش (الحمدلله) بڵێت وە سی و سێ جاریش (سبحان الله) ئەوە سەد دانەیە بەزمان و هەزار دانەیە لە تەرازووەکەیدا لە ڕۆژی کۆتایی (( کێتان هەیە لە شەو و ڕۆژێکدا هەزارو پێنج سەد گوناح بکات )) ... وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا چۆن ئەو دوو شتە ئاسانن و کەم کەسیش کاریان پێ دەکات ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : شەیتان دێتە لای یەکێکتان لەکاتی نوستنداو دەیخەوێنێت و ئەنجامی نادات وە لەکاتی نوێژەکەشدا دێتە لای یەکێکتان و پێویستیەکی دێنێتەوە بیر و دەڕوات و ئەنجامی نادات و ویردەکەی لەبیر دەباتەوە ) .



پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (( پێنج کار هەن هەر کەسێک ئەنجامیان بدات لەگەڵ باوەڕبوون پێیان دەچێتە ناو بەهەشت: هەر کەسێک پارێزگاری لە پێنج نوێژە فەرزەکەی بکات و دەستنوێژەکانیان و ڕکوع و سوجدەو کاتەکانیان وە هەروەها ڕۆژووی مانگی رەمەزان بگرێت و حەجی ماڵی خوا بکات و زەکات بدات و نەفسی خۆی پێ پاک بکاتەوە و ئەمانەت بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی ، وترا ئەی پێغەمبەری خوا : گێڕانەوەی ئەمانەت چییە ؟ فەرمووی : خۆشۆردنی لەشگرانیە خوای گەورە هیچ شتێکی لە ئاینەکەیدا بەئەمانەت گرنگ نەگرتووە وەک خۆشۆردن لەکاتی لەشگرانی )).

هەر کەسێک ئیمانی بەخواو بە پێغەمبەری خوا هەبێت و نوێژەکان بەرێک و پێکی ئەنجام بدات و مانگی رەمەزان بەرۆژوو ببێت ، ئەو کەسە خوای گەورە کردوویەتی بە پێویست لەسەر خۆی کە بیخاتە ناو بەهەشتەوە ، وە ئەو کەسە گەر خەباتی کردبێت لە پێناوی خوادا یاخود هەر لەو زەوییەدا دانیشتبێت کە تیایدا لەدایک بووە ...)).

حەجی چاک و تەواو پاداشتەکەی تەنها بەهەشتە.

## تێکۆشان و شەهید بوون لە پێناوی پەروەردگاردا وە جۆرەکانی شەهید :

هەر کەسێک هێندەی ماوەی وشتردۆشینێک بجەنگێت بەرامبەر دوژمنان بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت .

خوای گەورە کەفیلی ئەو مسوڵمانەی کردووە بیخاتە ناو بەهەشت کە بڕوای بەخوا هەیەو پێغەمبەرەکەی بەڕاست دەزانێت

وە خەبات دەکات و دەچێتە جەنگەوە لەماڵی خۆی دەرناچێت تەنها بۆ تێکۆشان نەبێت لە پێناوی خوادا و بۆ بەڕاست خستنەوەی وشەکانی خوا (ئەگەر شەهید بوو ) ، وە ئەگەر مایەوە خوا دەیگێڕێتەوە بۆ شوێنی خۆی بەو دەستکەوت و پاداشتە گەورەیەی کە بۆی بڕیارداوە ...

شەیتان لە هەموو ڕێگەیەکەوە خۆی مەڵاس داوە و لەبۆسەدایە بۆ مرۆڤی مسوڵمان سەرەتا لە ڕێگەی ئیسلامدا بۆی دادەنیشێت ... پاشان لە ڕێگەی کۆچکردنەوە ... ئینجا لە ڕێگەی خەباتەوە ... هەر کەسێک ئەوانە ئەنجام بدات (واتە سڵ لە بۆسەکانی شەیتان نەکاتەوە و گوێڕایەڵی نەکات ) ئەو کەسە خوای گەورە بەپێویستی داناوە لەسەر خۆی بیخاتە بەهەشتەوە ، وە هەر کەسێکیش جەنگ بکات لە پێناوی خوادا ، خوای گەورە کردوویەتی بە پێویست لەسەر خۆی بیخاتە بەهەشتەوە ، وە ئەگەر بخنکێت لە ئاویشدا هەر خوای گەورە کردوویەتی بە پێویست لەسەر خۆی کە بیخاتە بەهەشتەوە ، وە ئەگەر وڵاخەکەشی هەڵیدایە خوارەوە و مرد هەر خوای گەورە بە پێویستی داناوە لەسەر خۆی بیخاتە بەهەشتەوە .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : شەهیدەکان حەوت کۆمەڵن جگە لەو کەسەی لە جەنگدا شەهید دەکرێت لە پێناوی خوادا ، کەسێک توشی تاعون دەبێت شەهیدە ، وە کەسێک لە ئاودا دەخنکێت شەهیدە ، وە کەسێک بەنەخۆشی (ذات الجنب) (واتە : وەرەمێکە لە جەستەدا دروست دەبێت (نەخۆشی سەڕەتان) شەهیدە ، وە



ئەوەی بەنەخۆشی سکچوون دەڕوات هەر شەهیدە ، وە ئەو کەسەی دەسوتێت هەر شەهیدە ، وە ئەو کەسەی کە دارو بەردی خانوو بەسەریدا دەڕوخێ هەر شەهیدە ، وە ئەو ئافرەتەیشی کە بەسەر سکەکەیەوە دەڕوات هەر شەهیدە .

هەر کەسێک لە پێناوی پاراستنیماڵەکەیدا بکوژرێت ئەوە شەهیدە ، وە هەر کەسێک لە پێناوی پارێزگاریکردن لە خێزانەکەی بکوژرێت هەر شەهیدە ، وە هەر کەسێک لە پێناوی بەرگری لە ئاینەکەی بکوژرێت ئەوە شەهیدە ...

هەر کەسێک لە لوتکەی شاخێکەوە بکەوێتە خوارەوە یاخود دڕندە بیخوات یان لەناو دەریادا بخنکێت ئەوانە شەهیدن لای خوا.

هەر کەسێک داوای شەهیدی بکات لە خوای گەورە بەدڵسۆزی و ڕاستگۆییەوە ئەو کەسە خوای گەورە پلەی شەهیدی پێ دەبەخشێت گەر لەناو جێگاکەیدا مرد بێت .

## کاتێك پێ دەخەیتە ئەودیو دەرگای بەهەشتەوە



ئای خوایە کە خۆشە پێ ئەخەیتە ئەودیو دەرگای بەهەشتەوە تەماشا دەکەیت, چ وڵاتانێکی ناوازە بەڕووتدا دەکرێتەوە ، ئەو هەموو بیناو تەلارو نهۆمە گەورانە دەبینیت لەناو ئەو هەموو باخ و باخاتانە ئەو هەموو ڕووبارانەی بەژێریاندا دەڕوات ئەو هەموو کۆشک و ڤێلایانەی لەسەر دەریاکانی دروستکراون هەمووی لە ئاڵتوون و زیو و مرواری و گەوهەرن ، تەماشای ئەو هەموو کەشتیە ئاڵتوون و زیوانە دەکەیت لەناو دەریاو ڕووبارەکاندا هاتووچۆ دەکەن، ئەو هەموو دارو درەختە ڕەنگاو ڕەنگ و پڕ لە بەروبوومە بەتام و چێژانە دەبینیت ،

ڕووبارەکان بریتین لە ڕووباری شەراب و شیرو هەنگوین و ... هتد ، ئەو هەموو دروستکراوە پێشکەوتووە ئیلاهیانەی ئەوێ دەبینی بەشێوەیەک هێندە پێشکەوتووە بەستراوەتەوە بە حەزو ئارەزوو نیەت و بیرکردنەوەتەوە واتە تۆ تەنها بیری لێ بکەرەوە بەئامادەکراوی دێتە بەردەستت ...

ناتوانم زیاتر وەسفی بکەم چونکە مێشکی من بچوکەو لەچاو گەورەیی و خۆشی و پێشکەوتوویی ئەوێ عەقڵ ئەوەستێ لە وەسفی ئەوێدا

تەدەبور بکەن لە ئایەتەکانی کە باسی نیعمەتەکانی ناو بەهەشتە عەقڵت جام ئەبێ لە خۆشیەکانی ئەوێدا



وێنەکە : مرۆڤەکان دروستیان کردووە کە مێشکێکی مشتێک خۆڵین و زانستێکی کەم وسنورداریان هەیە ، ئەی ئەبێ خالقی مرۆڤەکان چی بونیاد نابێ لەو بەهەشتانەو مەملەکەتەکانی ناویدا کە خۆی بەدیهێنەرەو عەلیم وحەکیمەو خۆی زانستی هێناوەتە بوون .



## ئەگەر جوانی دونیا
## وەك بەهەشت بووایە چی روویدەدا ؟



- خوای گەورە ئەم سەر زەوییەی لە داروبەردو خۆڵ دروست کردووە ئەو خەڵکە پێی هەڵخەڵەتاوەو باوەشیان پیاداکردووە

- ئەی ئەگەر سەر زەوی هەروەک بەهەشت لە ئاڵتوون و زیو و مرواری و گەوهەر دروستی بکردایە حاڵیان چی دەبوو !؟

- خوای گەورە ئافرەتان و پیاوانی لە گڵ دروست کردووە هەمووی بوونەتە عەبدی یەکتر

- ئەی ئەگەر وەک جوانی حۆریەکان دروستی بکردنایە حاڵیان چی دەبوو ؟!

بۆیە ئەگەر دونیا وەک بەهەشت رازاوەو نەخشین بووایە وە مرۆڤەکانیش وەک جوانی حۆریەکان بوونایە ئەوا یەک ئیماندار لەسەر ئەم زەوییە نەدەبوو

تێبینی/ بەهەشت هێندە جوان و رازاوەیە کاتێک ئیمانداری موەحید دەچێتە ناوی دەگات بەهەر خزمەتکارێکی ناو ئەو بەهەشتە یەکسەر سوجدەی بۆ دەبات وادەزانێ پەروەردگارە تا فریشتەکان رێگری لێ دەکەن یاخود خزمەتکارەکە خۆی رێگری لێ دەکات دەڵێ سوجدەم بۆ مەبە من تەنها خزمەتکارێکی کۆشکەکەی تۆم .

بۆیە بەردەوام ببە لەسەر ئەنجامدانی ئەم کارانە بۆ بەدەستهێنانی نیشتیمانەکان و مەملەکەتەکانی ناو بەهەشت : لەوانە :

وتنی دوعای سید الاستغفار (( اللهم أنت ربي، لا إله إلا أنت، خلقتني وأنا عبدک، وأنا على عهدک ووعدک ما استطعت، أعوذ بک من شر ما صنعت، أبوء لک بنعمتک علي، وأبوء بذنبي فاغفر لي، فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت ))

واتە دوعای گەورەی داوای لێخۆشبوون کردن لە پەروەردگار بریتیە لە : ( خوایە تەنها تۆ خاوەن و پەروەردگاری منیت وە هیچ خوایەک نیە تەنها هەر تۆ خوایت تۆ منت دروستکردووە ، وە من بەندەی تۆم ، وە لەسەر گفت و بەڵێنەکەم بەردەوامم هەرچەندێ لە توانامدا بێت، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی ئەو کارانەی ئەنجامم داوە ، وە دان ئەنێم بەو نیعمەتانەی کە تۆ بەخشیوتە بەمن ، وە دان ئەنێم بە هەموو ئەو تاوانانەم کە ئەنجامم داوە خوایە لێم خۆشبە چونکە هیچ کەسێک لە گوناهەکان خۆش نابێت تەنها تۆ نەبێت ).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت : هەرکەسێک لە ڕۆژدا بیڵێت و بڕوای تەواوی پێی هەبێت و بمرێت لەو ڕۆژەدا پێش ئەوەی ئێوارەی بەسەردابێت ئەو کەسە یەکێکە لە خەڵکانی بەهەشت و بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت ، وە هەر کەسێکیش لە شەودا (واتە: ئێوارە) بیڵێت و بڕوای تەواوی پێی هەبێت و بمرێت لەو شەوەدا پێش ئەوەی بەیانی بەسەردا بێت ئەو کەسە یەکێکە لە خەڵکانی بەهەشت و بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت .

( ئەو کەسەی دایک و باوکی هەبێت و لە خزمەتیاندا بێت تا ئەوکاتەی پیردەبن ئەو کارەی بەسە کە بیخاتە بەهەشت )

وە لە موعاوییەوە رضي الله عنه دەفەرموویێت: هاتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ تا پرس و ڕاوێژی پێ بکەم کە بچم بۆ جیهاد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : ( ئایا دایک و باوکت ماون ؟) وتم بەڵێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : بڕۆ خزمەتیان بکە بەهەشت لەژێر پێی ئەواندایە ).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : باوکت دەرگای ناوەڕاستی بەهەشتە گەر پێت خۆشە پارێزگاری ئەو دەرگایە بکە یان وازی لێ بهێنە .

لە فەرموودەیەکی تردا ( پارێزگاری لە دایک و باوکت بکە یان وازیان لێ بهێنە )

**تێبینی/** مەبەست لە وازهێنان لێیان ئەوەیە کە ئەگەر ناتوانی خزمەتیان بکەیت وە دەرگای ناوەڕاستی بەهەشت بۆخۆت مسۆگەر بکەیت ئەوا عەزێتیشیان مەدەو زوڵمیان لێ مەکە کە چوونەتە تەمەنەوەو لەکاتێکدا تواناو هێزی تۆیان نەماوە بۆیە بەو زوڵم و ستەمە سەرجەم دەرگاکانی بەهەشت لەخۆت دامەخەو وازیان لێ بهێنە .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : (ڕازی بوونی خوا لە ڕازیبوونی دایک و باوکدایە وە ناڕازی بوونی خوا لە ناڕازی بوونی هەردووکیاندایە ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : ( خوای خۆتان بپەرستن و نوێژە فەرزەکانتان بەجێ بگەیەنن ... وە گوێڕایەڵی و مل کەچی سەرکردەی مسوڵمانی خۆتان بکەن دەچنە بەهەشتی خوای خۆتان ).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : ( هەر کەسێک بگات بە پەروەردگار لە ڕۆژی کۆتاییدا هاوبەشی بۆ بڕیار نەدابێت (واتە: لە دونیا) وە خوێنی حەرامی نەڕشتبێت ((ئەو کەسە)) دەچێتە بەهەشتەوە لە هەر دەرگایەک کە خۆی ویستی لێ بێت ).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : ( هەر پیاوێکی مسوڵمان دوو کچ یان دوو خوشکی هەبێت چاکەیان لەگەڵ بکات تا ئەو کاتەی لەگەڵیدا دەژین ئەو چاکەکردنەی لەگەڵیاندا دەیخاتە بەهەشت ).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : ( هەر کەسێک سێ کچ یاخود دوو کچی هەبێت و بیانگرێتە خۆی وە هەموو شتێکیان بۆ دابین بکات و بەڕەحم بێت بەرامبەریان تا ئەو کاتەی (( دەیاندات بەشوو)) ئەو کەسە بەهەشتی بۆ مسۆگەرە ) .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : ( هەر کەسێکتان سێ یان دوو جگەر گۆشەی بمرێت وە ئارام بگرێت و چاوەڕوانی پاداشت بکات ئەو کەسە دەچێتە بەهەشت ).

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێ : ( سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەو منداڵە کۆرپەیەی کە لەسکی دایکیدا لەبارچووەو مردووە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو منداڵە لەبارچووە بەو وێڵاشەی کە

بەستراوە بەسکی دایکیەوە دایکی ڕادەکێشێت بۆناو بەهەشت گەر ئەو ئافرەتە چاوەڕێی پاداشتەکەی لە خوا بکات ).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : ( خوای گەورە فەرمووی: گەر بەندەکەی خۆمم تاقیکردەوە بە لەدەستدانی هەردوو چاوە خۆشەویستەکەی بەڵام ئەو ئارام بگرێت و سوپاسم بکات لەسەری وە چاوەڕێی پاداشت بکات ، ئەو کەسە من ڕازی نابم هیچ پاداشتێکی بدرێتەوە کەمتر لە بەهەشت ).

## ئارام گرتن لەسەر پەرکەم و فێ و لەدەستدانی عەقڵ :

ئافرەتێکی رەشپێست هات بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت : ئەی پێغەمبەری خوا من جار جار توشی پەرکەم دەبم و جلەکانم لەبەر خۆم دادەکەنم دوعام بۆ بکە لای خوا تا شیفام بدات ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : گەر ئارام بگریت بەهەشت جێت دەبێت ، وە گەر ویستت لێیە دوعات بۆ دەکەم تا خوای گەورە شیفات بدات ، ئافرەتەکەش وتی : ئارام دەگرم بەڵام من کاتێ ئەو حاڵەتەم بەسەردا دێت جل لەبەری خۆم دادەکەنم تۆ دوعام بۆ بکە با وانەکەم ، پێغەمبەریش ﷺ دوعای بۆ کرد .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : (پیاوێک سەگێکی بینی خۆڵەکەی دەخوارد لە تینویەتیدا وە ئەو پیاوەش تاکێ لە پێڵاوەکانی بۆ داکەند و ئاوی بۆ هەڵکێشا تاکو سەگەکەی تێر ئاو کرد خوای گەورە سوپاسی کردو خستیە ناو بەهەشتەوە ).



لەفەرموودەیەکی تردا : ( پیاوێک نزیک بووەوە لە بیرە ئاوێک ، ئاوی لە بیرەکە خواردەوە و سەگێکی بینی لە تینویەتیدا زمانی دەرهێنابوو ئەویش رەحمی پێکرد و بەتاکێ لە پێڵاوەکانی ئاوی بۆ هەڵهێنجا و تێر ئاوی کرد و خوای گەورە سوپاسی کردو بردیە ناو بەهەشتەوە ).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : ( کابرایەک لە ڕێگەیەکدا ڕۆیشت و لقی دارێکی لەناوەڕاستی ڕێگەکەدا بینی و ئەویش وتی ئەبێ ئەم دارە لە ڕێگەی مسوڵمانان دووربخەمەوە تا ئازاریان نەدات (( بەڵکو خوای گەورە بەم کارە لێم خۆش بێت )) پاشان لقە دارەکەی لابردو خوای گەورە لێی خۆش بوو (( لە گوناهی ڕابردوو و داهاتووی خۆش بوو )) و بردیە ناو بەهەشتەوە ).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ : (( من و ئەو کەسەی کە منالێ بێ باوک دەگرێتە ئەستۆی خۆی لەبەهەشتدا وەک ئەم دوو پەنجەیە ✌ واین )) .

(( هەر کەسێک دوو کچ بەخێو بکات من و ئەو ئاوا ✌ دەچینە بەهەشت دواجار ئاماژەی بەهەردوو پەنجەی خۆی کرد )).

(( هەر دایک و باوکێکی مسوڵمان منداڵێکی بێ باوک بگرێتە ئەستۆی خۆی لەخواردن و خواردنەوەیدا تا ئەو منداڵە بێ باوکە گەورە دەبێت و پێویستی بەوان نابێت . ئەو کەسە بەهەشتی بەتەواوی بۆ مسۆگەر دەبێت )).

**تێبینی/** بەجدی کەسی فەوتاو و دۆڕاو ئەو کەسەیە کە بێ بەش بووە لە نیشتیمانەکانی ناو بەهەشت کە هێندەی پانتایی ئاسمانەکان و زەوییە .

## خۆشیە بێ وێنەکانی ناو جیهانی بەرزەخ ئەگەر بەهەشتی بیت !



سەرەتا/ خەڵکان کاتێک کە گوێیان لە وتارێک، یان کورتە ڤیدۆیەکی باسی مردن دەبێت، بەم شێوەیە لێی تێدەگەن کە لەراستیدا هەڵەیە..!

مەیتێکە شۆڕی دەکەنەوە بۆ ناو چاڵێکی تەسک و تەنگ و وە رۆیشتن بەرەو قوڵیەکی ٣ سێ مەتری تەسک و تاریک و پڕ لە ئازارو ئێش و عەزاب و سزا ، رۆیشتن بەرەو نەمان و لەناوچوون و فەوتان و تاریکایی سەخت.......هتد (خوای گەورە بمانپارێزێ لێی بەگەورەیی خۆی )

بۆچی تەنها بیرمان لای سزا بێ و بیرمان لای سۆزو رەحمەت نەبێ لە کاتێکدا سۆزو رەحمەتی لەسەر خۆی فەرز کردووە..... كتب على نفسه الرحمة....

ئایا...

- دەزانن خۆشترین ڕۆژ ڕۆژی گەیشتن بە پەروەردگارە

دەزانن کاتێ دەمرین ئەوکات دەگەین بە پەروەرێن و لەبەردەستی ارحم الراحمين دا دەبین.

واتا/ لەبەردەستی ئەو پەروەردگارەداین کە بۆ مرۆڤەکان بەسۆزو بەڕەحم ترە وەک لە دایکێ بۆ ڕۆڵەکەی!!

پێغەمبەر.... درودی خوای لەسەر....ئاژەڵێکی بینی سمەکانی لە بەچکەکەی دور دەخستەوە فەرمووی...(إن ربنا ارحم بنا من الام على إبنها), واتە.. بێگومان پەروەردگارمان زۆر بەرحم ترە لەدایک بۆ ڕۆڵەکەی

- ئایا نازانی ئەگەر تۆ بەهەشتی بیت کاتێک بەرزکرایتەوە بۆ ئاسمانی حەوتەم لەلایەن فریشتە رووگەش و بۆنخۆشەکان پەروەردگار مژدەی رازیبوون و مژدەی بەهەشتی پێ دایت و گۆرەکەت بۆ کرا بە باخێک لە باخەکانی بەهەشت و خواردنی بەهەشتی دەدەنێ و دەرگایەکت لەبەهەشت بۆ دەکەنەوە...ئەوکات بۆنی خۆشی بەهەشتت بۆ دێت و هەموو بەیانی و ئێوارەیەک شوێنت لە بەهەشت نیشان دەدەن تۆش دەپاڕێیتەوە لە پەروەردگارو دەڵێی خوایە قیامەت بەرپا بکە خوایە خێرا بکە ... بۆ ئەوە وا دەڵێیت کە زوو بچیتە ناو مەملەکەتەکانت لەناو بەهەشتدا..!

ئایا دەزانیت دوای ئەوانە بەهیچ شێوەیەک ناتەوێ و ئامادەنیت بگەرێیتەوە ژیانی دونیا بۆلای مناڵ و هاوسەرو دایک و باوکیشت؟

- ئایا نازانی کە کاتێک رۆحەکەت دەهێنرێتەوە سەر زەوی لە ئاسمانی حەوتەمەوە تۆ بەدیار جەنازەکەی خۆتەوەیت و پەلەپەل و هاوار لەو خەڵکە دەکەیت (بەڵام ئەوان گوێیان لێت نیە) کە زوو بتبەن بۆ ناو گۆرەکەت و بەهیچ شێوەیەک گریان و ناڵەی خزم و کەسەکانت بەخەیاڵدا نایەت گوێی پێ نادەیت ؟

- ئایا نازانن کە ئەگەر بەهەشتی بن ئەوا ئێوە دەرۆن بەرەو جیهانێکی نوێ و سەرنج راکێش و پێشکەوتوو ؟

- ئایا نازانن کە دەڕۆن بەرەو خۆشیەکی بێ وێنە پڕ لە ئیسراحەت و ئارامی ؟

- ئایا نازانن کە دەڕۆن بەرەو لای خزم و کەسەکانتان لە وێنەی کە بەهەشتین و عاقیبەت خێربوون و پێش ئێوە نەقڵ بوون و مردوون ؟

- ئایا نازانن کە عاقیبەت بەهەشتیەکان ڕزگاریان بووە لە نارەحەتی و سەرما و گەرما و هیلاکی و ڕاکەراکی دونیا ؟

- ئایا نازانن کە کاتێک مرۆڤەکان دونیا جێ دەهێڵن ئەگەر بەهەشتی و موتەقی و ئیماندار بووبێتن ئیتر لەوێ دەگەن بە ئیسراحەت و نوستنی پڕ لە خۆشی و چێژ ؟

- ئایا نازانی کە لەو جیهانەدا تۆ ڕۆژانە بەردەوام لەگەڵ کەس و کارو هاورێکانت (ئەگەر بەهەشتی بووبن) دائەنیشیت و باسی دونیایان بۆ دەکەیت باسی حاڵ و وەزعی کەسەکانیان بۆ دەکەیت؟

- ئەی ئایا نازانی کە تۆش لەو جیهانەدا بە تامەزرۆییەوە چاوەڕێی کەسێکی تری خۆت دەکەیت لە زیندووەکان تا بەعاقیبەت خێریەوە بێت و نەقڵ بێت بۆلات تا پرسیاری کەس و کارت و دونیای لێ بکەیت ؟

- ئایا تۆ بێکەسیت لەناو گۆڕەکەت دا ؟

لەکاتێکدا گۆڕەکەت بووە بە مەملەکەتێکی کاتی زۆر خۆش و ئارامی جیهانی بەرزەخ !



نا بەڵکو تۆ لەگەڵ ملیارەها مرۆڤی تریدات کە ئەوانیش بەهەشتین و هەر لە ئادەمەوە هەتا ئەم سات و کاتەی ژیان کە خەڵکان نەقڵ دەبن بۆی .....

بگرە ئەو جیهانە قەرەباڵغترە لە ئەمڕۆی خۆمان کە ئەمڕۆی دونیا بەنزیکەیی ٨ ملیار مرۆڤە.

- ئایا نازانن کە بەهەشتیەکان لەناو مەملەکەتەکانیان لە جیهانی بەرزەخدا نوێژەکانیان ئەنجام دەدەن  بەتایبەتی نوێژی بەیانیان و ئێواران ؟

زۆر زۆری تر هەیە دەربارەی خۆشیەکانی جیهانی بەرزەخ .......

**تێبینی/** سزاو عەزابی ناو گۆڕەکانی و چاڵە ئاگرینەکانی ناو قەبر بۆ کافرو بێ دین و مونافیقەکانە هەروەها بۆ مسوڵمانە زۆر تاوانبارەکانە کە بەردەوام لەناو فەسادو تاوانی جۆراوجۆردا بوون ... هتد.

ئەو کارە ئاسانانەی دەتخەنە بەهەشتەوە دوای ئیمان و ئیسلام

(( پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو پێی وت : کارێکم نیشان بدە کە بمخاتە بەهەشتەوە ؟ فەرمووی تورە مەبە بەهەشت بۆ تۆ دەبێت )) .

لە شورەیحەوە ئەویش لەباوکیەوە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم پێ بڵێ کە بەهەشتم بۆ مسۆگەر بکات ؟ ئەویش فەرمووی : (( وتەی شیرین و سەلامکردن وخواردن بەخشین)).

ئەنەس رضي الله عنه دەفەرموویێت : دانیشتبووین لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ، وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( .... ئێستا پیاوێکی خەڵکی بەهەشت دێتە ئێرە ، ئەوەندەی پێ نەچوو پیاوێکی ئەنصار دەرکەوت کە تازە دەستنوێژی شۆرد بوو ئاو لە ڕیشی دەتکا وە نەعلەکانی بەدەستی چەپیەوە گرتبوو ، ئەنەس دەفەرموویێت : وە ڕۆژی دواتر دیسان دانیشتبووینەوە پێغەمبەر ﷺ هەر ئەو وتەیەی فەرموو وەکو یەکەمجار وە هەمان پیاو هات ، وە ڕۆژی سێیەمیش هەمان وتەی فەرموو ، وە ئەو پیاوە بەهەمان حاڵەتی یەکەمجاری دەرکەوتەوە کاتێ پێغەمبەر ﷺ هەستا عبدالله کوڕی عەمر دوای ئەو پیاوە کەوت و پێی وت : من لەگەڵ باوکمدا دەمەبۆڵەیەکم بووەو وە سوێندم خوارد وە تا سێ ڕۆژی تر نەچمەوە ماڵی باوکم گەر تۆ پێت خۆش بێت و ڕێگەم بدەیت من تا ئەو سێ ڕۆژە لە ماڵی تۆدا دەمێنمەوە .. ئەنەس رضي الله عنه دەفەرموویێت : عبدالله باسی دەکرد کە ئەو لەو سێ شەوەدا لەگەڵ ئەو پیاوەدا بووەو نەیبینیوە لە شەودا شەونوێژێکی وا بکات بەڵام هەرکات لە خەو بەئاگا بهاتایە (الله اکبر) و زیکری خوای دەکرد لە جێگاکەیدا تا هەڵدەسا بۆ نوێژی بەیانی ، بەڵام لەو سێ ڕۆژەدا قسەیەکی خراپم لێ نەبیست دوای ئەوەی ئەو سێ شەوە تێپەڕی وە نزیک بوو کارەکانیم زۆر بەکەم بێتە پێش چاو بۆیە پێم وت : هیچ تورەبوون و دڵئێشانێک نەبووە لە نێوانی من و باوکمدا بەڵام گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو سێ جار ئاوای فەرموو ، تۆش سێ جارەکە هاتی ، لەبەرئەوە منیش ویستم بێم بۆ ماڵتان تاکو چاوم لەکارەکانت بێت و لاساییت



بکەمەوە بەڵام نەمبینی کارێکی وا زۆرت کردبێت تا لەسەر ئەو کارە پێغەمبەر ﷺ شایەتی بەهەشتی بۆ دابیت ! ئەویش وتی : واللە یی هەر ئەو کارەم ئەنجام دەدەم کە تۆ بینیت . وە کاتێک ڕۆیشتم بانگی کردمەوە وتی : وەرە ئەوەی کە بەمنەوە بینیوتە من هەموو جار ئاوا دەکەم ، بەڵام من دوو شتم هەیە لە ژیانمدا ناپاکی و قین لە دڵمدا نیە بەرامبەر بە مسوڵمانان وە خوای گەورە هەر نیعمەتێک بدات بەهەر کەسێک حەسوودی پێ نابەم ، عبداللە وتی : بەراستی ئەو دوو ڕەوشتەیە تۆی گەیاندۆتە بەهەشت (وە ئێمە توانای ئەوەمان نیە).

ئەبو هورەیرە رضي اللە عنە دەفەرمووێت : (( جارێکیان بە پێغەمبەریان وت ﷺ ئەی پێغەمبەری خوا : فلأن ئافرەت بە شەو شەونوێژ دەکات و بەڕۆژیش بەڕۆژوو دەبێت و چاکە دەکات و خێر دەکات بەڵام شتێکی هەیە ئەویش ئەوەیە ئازاری دراوسێ زۆر دەدات بەزمانی (واتە بە قسە پێ وتن وغەیبەتکردن ) پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (ئەوە خێری تیانیەو ئەو ئافرەتە لە کەسانی ناو دۆزەخە ) وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا فلأن کەسیش نوێژە فەرزەکان دەکات و رەمەزانانیش بەڕۆژوو دەبێت (باسی کردەوەکانیان کرد کە زۆر کەمە ) وە پارچە بچکۆلەی پەنیر نەبێت نایکات بەخێر (بەڵام ئازاری دراوسێکانی نادات) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوە یەکێک لە کەسانی ناو بەهەشتە )).

لە عودەی کوڕی عومیرەوە رضي اللە عنە دەفەرمووێت: (( پیاوێکی کیندەیی ناوی ( إمرؤ القیس) کوڕی عباس بوو

دەمەقاڵەی بوو لەگەڵ پیاوێکی ناوچەی (حضرة الموتي) لەسەر پارچە زەوییەک ، هەردووکیان هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وە پێغەمبەر ﷺ بە کابرا حەزرەمەوتیەکەی فەرموو : ئەبێ بەڵگە بهێنیت ، ئەویش بەڵگەی نەبوو بۆیە دواجار داوای لە ( امرؤ القیس ) کرد کە سوێند بخوات حەزرەمەوتیەکەش وتی : وەڵایی ئەی پێغەمبەری خوا گەر ڕێگەی بدەیت ئەو سوێند بخوات هەموو ماڵەکەم دەڕوات پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( هەر کەسێک سوێندێکی درۆ بخوات بۆ زەوتکردنی ماڵێکی برای مسوڵمانی بۆ خۆی ئەو کەسە دەگاتەوە بەخوا لە ڕۆژی قیامەتدا و خوای گەورە زۆر لێی بە توڕەیە )) وە (امرؤ القیس) وتی : ئەگەر ئەو سوێندە بزانیت لەسەر حەقیت وازی لێ بهێنیت لە پێناوی خوادا پاداشتی چیە ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : [ بەهەشتە ] : ئەویش وتی : ئەوا من وازم لێ هێنا )).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

(( ئەی خەڵکان سەلام لەیەکتری بکەن و خواردن بدەن بەهەژاران و بەشەو شەونوێژ بکەن لە کاتێکدا خەڵکان نوستوون، بەسەلامەتی دەچنە بەهەشت )).

(( دادوەران سێ کەسن : دوانیان لە ئاگردایەو یەکیان لە بەهەشتدایە ، ئەوەی کە لە بەهەشتدایە پیاوێکە حەقی زانیوە و فەرمانی بەحەق داوەو کاری پێکردووە ئەوە لەبەهەشتدایە ... )) .



(( هەر کەسێک لە ڕۆژی قیامەتدا بێت و بەری بێت لە سێ شت دەچێتە بەهەشتەوە : خۆبەزلزانین و دزین لە دەستکەوت و قەرزاری )).

(( هەر کەسێک ڕێگەیەک بگرێتە بەر بۆ فێربوونی زانستێکی شەرعی خوای گەورە یەکێک لە ڕێگەکانی چوون بۆ بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات )).

(( هەرکەسێک پێی خۆشە خوای گەورە لە دۆزەخ بیپارێزێت و بیخاتە ناو بەهەشت ، با مردبێت لەسەر باوەڕبوون بەخوا و ڕۆژی دوایی وە ئەوەشی کە پێی خۆش بووە خەڵکان بەرامبەر بەخۆی ئەنجام بدەن ئەویش پێی خۆش بێت کە بەرامبەر بەخەڵکان ئەنجامی بدات )).

(( دوو چاو هەن ئاگر نایانسوتێنێت ، چاوێک لە ترسی خوا گریا بێت وە چاوێکیش شەونخونی و پاسەوانی کردبێت لە پێناوی خوادا ))

(( ناچێتە ئاگر پیاوێک گریا بێت لە ترسی خوای گەورە تاکو شیر نەگەڕێتەوە بۆ گوانی ئاژەڵەکە ، وە تەپ و تۆزاوی بوون لە پێناوی خوادا لەگەڵ دوکەڵی دۆزەخدا کۆنابنەوە لە لوتی هیچ مسوڵمانێکدا هەتا هەتایە )).

(( شەرم کردن و بێدەنگی لە باوەڕەوەیە وە هەردووکیان خاوەنەکانیان نزیک دەکەنەوە لە بەهەشت و دووریان دەخات لە دۆزەخ ))

(( هەر کەسێک کەفیلی ئەوەم بۆ بکات داوا لە هیچ کەس نەکات منیش کەفیلی بەهەشتی بۆ دەکەم )).

ثەوبان رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (( هەر کەسێک تەنها ئەم قسەیەم لێ وەربگرێت من کەفیلی چوونە ناو بەهەشتی بۆ دەکەم )) وتم : من ئەی پێغەمبەری خوا چیە ؟ ، فەرمووی : داوای هیچ شتێک لە کەس مەکە )).

(( هەر کەسێک زەمانەتی نێوانی هەردوو ڕیشی (واتە: زمان) و هەردوو قاچی (واتە: عەورەتی) بکات من زەمانەتی چوونە ناو بەهەشتی بۆ دەکەم )).

(( چل شت هەن بەرزترینیان بەخشینی بزنە ، هەر کەسێک یەکێک لەو چل شتە ئەنجام بدات بەهیوای پاداشتەکەی و بەڕاست زانینی پاداشتەکەی ئەو کەسە خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە)).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

(( ئاگاداربن خاوەن کتێبەکانی پێش ئێوە (واتە مەسیحی و جولەکەکان) بەش بەش بوون بۆ حەفتاو دوو کۆمەڵ وە ئەم ئومەتەش (واتە : مسوڵمانان) دەبێت بە حەفتاو سێ کۆمەڵ ، حەفتاو دوو کۆمەڵیان لە ئاگردان و تەنها یەک کۆمەڵیان لە بەهەشتدان ئەویش کۆمەڵی (الجماعة) یە.

پرسیارکرا : ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی: ئەوانەن کە لەسەر هەڵسوکەوت و باوەڕو ڕەوشتی من و هاوڕێکانمن )).

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو هەڵسوکەوت ورەفتارەکانیان لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرتووە.

ڕوونکردنەوەی هاوەڵان و زانایان دەربارەی وشەی (الجماعة) رضي الله عنهم و رحمهم الله :

ابن مسعود / (الجماعة) بریتیە لە شوێنکەوتنی تەواوی قورئان و سوننەت و ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ هەرچەندە هەر خۆت بەتەنها بیت . ئەوەیە کە هاوڕێی حەق و ڕاستی بیت هەرچەندە هەر تەنها خۆت بیت .

ئیمامی علي/ (الجماعة) وەڵایی بریتیە لە کۆبوونەوەو پشتیوانی حەق خوازان گەر کەمیش بن ، فرەق و پەرتەوازەییش کۆبوونەوەو پشتیوانی ناحەق خوازان گەر زۆریش بن .

ئیمامی ترمذی / (الجماعة) لای زانایان ئەوانە دەگرێتەوە کە خاوەن زانست و تێگەیشتنن لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ .

ئیمامی بوخاری / (الجماعة) بریتین لە شارەزاو زانایانی زانستی ئاین ( الجماعة و هم اهل العلم ).

ابن سنان / (الجماعة) ئەوانەن کە زانان بە وتەکانی پێشینان وشوێن کەوتووی ئەوانن .

ابن حبان دەفەرمووێ : فەرمانکردن بە شوێنکەوتنی (الجماعة) کە زاراوەیەکی گشتیەو مەبەست پێی شتێکی تایبەتە چونکە (الجماعة) کۆی ڕێبازی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆیە

هەر کەسێک لەسەر کاری ئەوان بێت و دوورە پەرێز بێت لە کاری دوای ئەوان ، ئەوا لای نەداوە و جیانەبۆتەوە لە (الجماعة) بەڵام هەر کەسێک لەوان جیابووبێتەوە و شوێنی ڕێبازێکی تری دوای ئەوان کەوتبێت ئەوا لە (الجماعة) لای داوە ، وە (الجماعة) لەدوای هاوڕێیانی پێغەمبەر ﷺ بریتیە لە کەسانێک کە دینداری و شارەزاییان تیا کۆبۆتەوەو لە هەموو ئارەزووەکان خۆیان بەدوور گرتووە هەرچەندە ژمارەشیان کەم بێت نەک شوێنکەوتنی ئاژاوەچیان هەرچەندە ژمارەشیان زۆر بێت .

وە زاراوەی (اهل السنة والجماعة) واتە : شوێنکەوتنی سوننەت و ڕێڕەوی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەش دژە لەگەڵ زاراوەی (أهل البدع و الاختلاف) واتە شوێنکەوتووی داهێنراوانی ناو ئاین و پەرتەوازەیی و ناکۆکی ، وە ئەوانە شوێنکەوتووانی هەواو ئارەزوون .

ابو ئومامە کاتێک کوژراوانی خەواریجی بینی گریا ، لەوێدا پێی وترا : بۆچی دەگریت ؟ فەرمووی : دەگریم بۆ دەرچوونیان لە ئیسلام ، ئەوانە خۆیان جیاکردەوەو ئاینەکەیان کردە چەند تاقم و کۆمەڵێکی جیاواز .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت :

(( خوای گەورە ڕێگەی تەوبەی گرتووە لەو کەسەی کە بیدعە دەکات تاکو واز لە بیدعەکەی دەهێنێت (واتە : هیدایەتی نادات بۆ تۆبەکردن چونکە کارە داهێنراوەکەی خۆی بەرەوا دەزانێت )).



لە ئەنجامدا دەرکەوت کە : وشەی (الجماعة) ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت : (( ... ما انا علیه و اصحابي الیوم ))

واتە : (( ئەو ڕێبازەیە کە ئەمڕۆ من و هاوەڵانمی لەسەرە )).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت :

(( پابەند بن بە سوننەتەکانمەوە وو هەروەها بە سوننەتی خەلیفە راشیدینەکانەوە لەدوای من ، بە ددانەکانتان توند بیگرن و لێی لامەدەن ))

(( ... هەر کەسێکتان حەزدەکات ناوەراستی بەهەشت بۆ خۆی بەدەست بهێنێت با پابەند بێت بە جەماعەوە ... ))

## بیهێنە پێش چاوەکانی خۆت...!



تۆ لەم دونیا پڕ لە نارەحەتی و پڕ لە راکەراک و نەخۆشی و ناخۆشی و هیلاکی و ماندوویێتیەدا نەقڵ دەبیت بۆ جیهانی بەرزەخ و لەویش وادایبنێ هەزاران ساڵ دەمێنیتەوەو پاشان زیندوو دەکرێیتەوە بۆ گەرماکەی ناو گۆڕەپانی قیامەت و هەزاران ساڵ رادەوەستی و نارەحەتی و تەرازوو و لێپێچینەوەو حساب و کتاب دەکرێیت و پاشان بۆ ناوچە تاریکیەکان رەوانەدەکرێیت پاشان بۆ نارەحەتیەکانی سەر پردی سیڕات و ... هتد

لەدوای هەموو ئەم مەرحەلە پڕ لە عەزێت و ناخۆشی و ئازارانە پەروەردگار بەهۆی ئیمانەکەت و تەوحیدەکەت و نوێژەکانتەوە رەحمی پێ کردیت و خستیتیە ناو وڵات و نیشتمان و مەملەکەتەکانی بەهەشتەوە

بۆیە بەراستی ئەوانەی لەدڵەوە ئیمانیان بە تاک و تەنهایی پەروەردگار هێناو هیچ شەریکێکیان بۆ بڕیار نەدا وە لەسەر ئەو ئەساسی ئیمانەش هەموو هەوڵ و کارەکانیان بووە چاکەکردن، بەدڵنیاییەوە ئا ئەوانە پەروەردگار لەسەر بناغەی ئیمانەکەیان هیدایەت و چاوڕۆشنی و ڕێنوێنی زیاتریان دەکات و پاشان هەدێشیان دەکات بە نیشتمانانێک (وڵاتانێک) لەناو بەهەشتەکاندا کە پڕ لە نیعمەتەو ڕوباری گەورە گەورە بەژێریاندا دەڕوات

وتەی ئەو بەختەوەرانە لەناو مەملەکەتەکانیان لەناو بەهەشتەکاندا تەنها بریتیە لە سبحان الله (پاک و بێگەردی بۆ الله) لە گەورەیی و جوانی و رازاوەیی ئەو باخ و باخات و رووبارو دەریایانە ، ئەوانە دەڵێن پاک و بێگەردی بۆ الله جل جلالە لە نەخشینی و جوانی ئەو بیناو باڵەخانانەی ناو نیشتیمانەکانی بەهەشت ، پاک و بێگەردی بۆ پەروەرێن لە بەنرخی و جوانی ئەو هەموو کەل و پەل و باخیرەو کەشتیە زێڕ و زیوانەی ناو بەهەشتەکان ، پاک و بێگەردی بۆ پەروەرێن لە جوانی ئەو کۆشک و ڤێلا پێشکەوتووانەی ناو مەملەکەتەکانی نیشتمانەکانی ناو بەهەشتەکان ، پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگار لە پێشکەوتویی ناو بەهەشت و جوانی و رازاوەیی بەهەشت ... هتد

ئەو بەهەشتیانە هێندە دڵخۆش و کامەرانن هێندە لەناو جوانی نەخشینی و بەهەشتی رازاوەو پێشکەوتوودان هەموو وتەو قسەیەکیان تەنها سبحان الله و سلام علیکم دەبێت و وە کۆتایی هەموو قسەکانیشیان بریتیە لە الحمدلله بۆ ئەو پەروەرێنەی کە ئێمەی خستە ناو ئەم هەموو نیعمەتە گەورەو جوان و بەنرخ و بێ ئەندازانەوە لە وڵاتەکانمان لەناو بەهەشتی گەورەدا

تۆی نەگبەتیش هەر خۆت هەڵبخەڵەتێنەو گوێ بۆ مولحیدو بێ دینەکان بگرە

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت :

(( هەر کەسێک کۆیلەیەکی خاوەن باوەڕ ڕزگار بکات خوای گەورە بە هەر ئەندامێک لە لاشەی ئەو کەسە کە ڕزگاری دەکات،



خوای گەورە هەمان ئەندامی لاشەی ئەم ڕزگار دەکات لە ئاگری دۆزەخ ))

دەشتەکیەک هات بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ وتی ئەی پێغەمبەری خوا : کارێکم فێر بکە بمخاتە ناو بەهەشتەوە ؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو : (( هەر چەندە وشەکانت کورت بوون بەڵام پرسیارەکەت بەباشی خستە ڕوو : تۆ بەندە ئازاد بکە و یارمەتی کۆیلە بدە . پیاوەکە وتی بۆ هەردووکیان وەک یەک نین ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : نەخێر (عتق النسمة) ئەوەیە کۆیلەی خۆت ئازاد بکەیت بەڵام (فک رقبة) ئەوەیە لەگەڵ کەسانی تردا پارە کۆبکەیتەوە و یارمەتی بدەیت تا کۆیلەیەک ڕزگار بکەیت )). (( ....... وە ئاژەڵی پڕ شیر ببەخشە و چاکە بکە لەگەڵ خزمێکدا کە پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵتدا بڕیوە، گەر ئەویشت نەتوانی نان بدە بە برسی و کەسێکی تونی تێر ئاو بکە و فەرمان بەچاکە بکەو ڕێگری لە خراپە بکە ، گەر ئەوەشت نەتوانی تەنها وتەی چاک بەزمانت بڵێ )).

تێبینی/ لەمڕۆدا کە کۆیلە نەماوەو هەموومان وەک دانیشتووانی سەر زەوی بووین بە کۆیلەی نیزامی عالەمی ئەگەر بتوانین هەژارێک لە هەژاری رزگار بکەین بەیەک جار بەکڕینی ئۆتۆمبێلێک بێت یان خانوویەک بێت و بیخەینە سەرپێی خۆی لەکۆیلەیەتی و سواڵ رزگاری بکەین بەهەر هۆکارێک لە هۆکارەکان وەک ئەوەیە کۆیلەیەکمان رزگار کردبێت لە کۆیلایەتی هەژاری والله اعلم .

((پیاوێک هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی : ئەی پێغەمبەری خوا کارێکم نیشان بدە نزیکم بکاتەوە لە بەهەشت و دوورم بخاتەوە



لە ئاگر ؟ فەرمووی : خوا بپەرستەو هاوبەشی بۆ بڕیار مەدە و نوێژەکانت بکەو پەیوەندی خزمایەتی بە جێ بهێنە ، کاتێ کابرا ڕۆیشت ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی گەر دەست بگرێت بەوانەی کە فەرمانی پێکراوە دەچێتە بەهەشتەوە )).

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : (( وتم ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم پێ بڵێ گەر ئەنجامی بدەم بمخاتە بەهەشتەوە ئەویش فەرمووی : سەلام لەیەکتر بکەو خواردن بدە بەهەژاران و سیلەی ڕەحم بەجێ بگەیەنە و لە شەودا کە خەڵکان خەوتوون شەو نوێژ بکە بە سەلامەتی دەچیتە بەهەشت )).

ئەبو کەثیری زوبەیری دەڵێت بە ئەبو زەرم وت : کردەوەیەکم نیشان بدە گەر بەندە ئەنجامی بدات بچێتە بەهەشتەوە ؟ وتی: منیش هەمان پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەوەڵامدا فەرمووی : (( بڕوا بوون بەخوا )) منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ بڕوادا کردەوەیەکی تر هەیە بەندە بیکات ؟ فەرمووی: (( لەوەی خوا پێی بەخشیوە بەشی خەڵکی بدات )) . وتم : ئەی پێغەمبەری خوا گەر ئەو کەسە هەژار بوو نەیتوانی یارمەتی خەڵکی بدا ؟ فەرمووی : (( با بەزمانی وتەی چاک بڵێت و فەرمان بە چاکە بکات وڕێگری لە خراپە بکات )) . وتم : ئەی پێغەمبەری خوا گەر ئەو کەسە زمان پاراو نەبێت و نەتوانێ فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە بکات ؟ فەرمووی : (( با یارمەتی بێ دەسەڵاتێک بدات )). وتم : ئەی پێغەمبەری خوا گەر ئەو کەسە بێهێز ولاواز بێت نەتوانێت یارمەتی ستەم لێکراو بدات ؟ پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی لێدامەوەو فەرمووی : (( ناتەوێت هیچ چاکەیەک



لەو هاوەڵەتا بهێڵێت ، با ئازاری کەس نەدات )). منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئەو شتانە هەموو کارێکی ئاسانن گەر ئەوانە ئەنجام بدات دەچێتە بەهەشتەوە ؟ فەرمووی : (( هەر یەکێک لەو کارانە ئەنجام بدات تەنها لە پێناوی خوادا تۆ دەستی دەگریت لە ڕۆژی کۆتاییدا و لێی جیانابیتەوە تا دەیخەیتە بەهەشت )).

ئەبو زەر دەفەرموویێت : وتم ئەی پێغەمبەری خوا چاکە چۆن بکەین خۆ ئێمە پارەمان نیە ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : ((دەرگاو بوارەکانی چاکە ئەمانەیە : وتنی (الله اکبر) و (سبحان الله) و (الحمدلله) و (لا اله الا الله) و (استغفرالله) ، فەرمان کردن بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپە ، لابردنی دڕک وئێسک و بەرد لە ڕێگەی خەڵکیدا ، و دەستگرتنی نابینا و دووبارەکردنەوەی قسە بۆ (گوێ گران و کەڕو لاڵ) تا دەبیستێت و تێی دەگات ، وە نیشاندانی جێگەی پێویست بۆ ئەو کەسەی پرسیارت لێ دەکات ، وە ڕاکردن بەهەموو هێزەکانی قاچەکانت بۆ فریاکەوتن و بەهانا چوونی لێقەوماو ، وە هەڵگرتنی بەهەموو توانای دەستەکانت بۆ یارمەتی لاوازو بێ توانا هەموو ئەوانە بوارەکانی چاکەن کە بۆ خۆتی ئەنجام دەدەیت )).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت :

(( خوای گەورە پیاوێکی کردە ناو بەهەشتەوە لە کڕین و فرۆشتندا نەرم و نیان بوو وە لە دەمە بۆڵەو ماف دان و ماف وەرگرتندا هەر نەرم و نیان بووە ))

(( ئایا پێتان ڕاگەیەنم ئاگر لەسەر کێ حەرامەو وە کێ لەسەر ئاگر حەرامە ؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی :



ئاگری دۆزەخ حەرامە لەسەر هەموو مسوڵمانێکی زۆر خۆ بەکەم زان و نەرم و گونجاو و نزیک لە خەڵکی ))

(( شەش شتم بۆ مسۆگەر بکەن (لەلایەن خۆتانەوە) منیش بەهەشتتان بۆ مسۆگەر دەکەم : ڕاستگۆبن کاتێ قسە دەکەن ، گەر بەڵێنتان دا بەجێی بهێنن ، وە ئەگەر ئەمانەتێکتان لابوو بیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکەی ، وە داوێنتان بپارێزن ، و چاویشتان داخەن (لە نەزەری حەرام) ، وە دەستیشتان بپارێزن )).

(( پێنج کار هەن هەر کەسێک لە ڕۆژێکدا ئەنجامیان بدات خوای گەورە ناوی تۆمار دەکات لە ڕیزی ناوی بەهەشتیەکاندا : هەر کەسێک سەردانی نەخۆش بکات و ئامادەی جەنازەیەک ببێت و ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو بێت و زوو بچێت بۆ نوێژی جومعە و کۆیلەیەک ئازاد بکات )).

(( هەر کەسێک بەڕۆژوو بوونی بکەوێتە جومعەوە و سەردانی نەخۆشێک بکات و لەگەڵ جەنازەیەکدا بڕوات و یارمەتی یەکێک بدات و کۆیلەیەک ئازاد بکات ئەو کەسە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت )).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( کێ لە ئێوە ئەمڕۆ بەڕۆژوو بووە؟)) ئەبو بکر فەرمووی من ، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( کێ لە ئێوە ئەمڕۆ بەدوای جەنازەیەکدا ڕۆیشتووە ؟ )) ئەبو بکر فەرمووی من ، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (( ئەم کارانە لەهەر کەسێکدا کۆ ببێتەوە دەچێتە بەهەشتەوە )).



(( هەر کەسێک لە پێناوی خوادا تێبکۆشێت لە زەمانەتی خوادایە (واتە بەهەشتیە)..... )).

(( پێنج کار هەن هەر کەسێک یەکێک لەو کارانە ئەنجام بدات لە زەمانەتی خوادایە : هەر کەسێک سەردانی نەخۆشێک بکات یاخود لەگەڵ جەنازەیەکدا بڕوات یاخود سەردانی سەرکردەیەک بکات تا ڕێزی لێ بگرێت ، یاخود لە خانووەکەی خۆیدا دابنیشێت و سەلامەت بێت لە خەڵکی وە خەڵکیش سەلامەت بن لە دەست و زمانی ئەو (واتە لە پاشەملە باسی هیچ کەسێک نەکات ). ))

(( سێ کۆمەڵ هەن لە زەمانەتی خوادان گەر بژین ڕزقیان بۆ زیاد دەکات و بەدووریان دەکات لەهەموو ناخۆشیەک ، وە گەر مردیشن دەیانخاتە ناو بەهەشت : هەر کەسێک بچێتەوە ماڵەوە سەلام بکات یاخود سەلامەت بێت ئەو کەسە لە زەمانەتی خوادایە، وە هەر کەسێک بچێتە دەرەوە بۆ مزگەوت لە زەمانەتی خوادایە ، وە هەر کەسێک بچێتە دەرەوە بۆ تێکۆشان لە پێناوی خوادا ئەویش لە زەمانەتی خوادایە )).

(( سێ شت هەن هەر کەسێک تیایدابێت قەدەغەکراوە لە ئاگر وە ئاگریش قەدەغەکراوە لەو : ئەویش بڕوا بوونە بە خوا ، لەگەڵ خۆشەویستی خوا ، وە ئەو کەسە فڕێدانە ناو ئاگری لا خۆشەویستتر بێت لەگەڕانەوە بۆ سەر بێ باوەڕی )).

خوای گەورە دەفەرموویێت { .... ذلک لمن خشي ربه } (البينة ٨) . واتە : (بەهەشت بۆ ئەو کەسەیە کە لە پەروەردگاری ترساوە).



هەروەها پەروەردگار دەفەرموویت { .... ذلك لمن خاف مقامي و خاف وعيد } (إبراهيم ١٤). واتە: ( بەهەشت بۆ ئەو کەسەیە کە لە گەورەیی پێگەو مەقام و شکۆی الله ترساوەو شەرمی کردووە، وە ترساوە لە گەڕانەوەی بۆ ڕۆژی قیامەتی بەڵێنپێدراو بە بوونەوەران ).

ئەبو دەرداء دەفەرموویت : (( گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە { ولمن خاف مقام ربه جنتان } (الرحمان ٤٦). واتە: { ئەو کەسانەی لە گەڕانەوەیان بۆ بەردەم مەقام و شکۆو پێگەی پەروەردگاریان دەترسن دوو باخیان (نیشتیمانی رازاوەیان) بۆ هەیە لەبەهەشتدا } ، ئەبو دەرداء دەفەرمووێ منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ئەو کەسە دزی کرد یان زینای کرد ؟ پێغەمبەریش ﷺ دیسان ئەو ئایەتەی بۆ دووەمجار خوێندەوە ، منیش وتەکەم دووبارەکردەوە ، لە سێیەم جاردا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ((هەرچەندە ئەبودەردائیش پێی خۆش نەبێت)) واتە: (ئەو کەسە لە خواترسە دەچێتە بەهەشت) )).



## دڵتان فێنك بكەنەوە ، دڵتان ببوژێننەوە

ئایا زانیوتە ئەو پێشکەوتن و تەکنەلۆژیایەی کە لەناو بەهەشتدا هەیە نەچاو بینیویەتی نە گوێ بیستوویەتی نە بەخەیاڵ و ختورەش بەدڵدا هاتووە

ئایا دەزانی جوانی و رازاوەی ناو ئەو بەهەشتانە بەشێوەیەکە ئەگەر کەسێک هەموو تەمەنی لە خۆشترین شوێنی ئەم سەر زەوییە بووبێت و لەژیانیا ناخۆشی نەبینیبێت بەیەکجار پیشاندانی ناو بەهەشت بەخۆی دەڵێ لەژیانما خۆشیم نەبینیوە

ئایا دەزانیت لەناو بەهەشتدا ماندووبوون نیە خەم و هەم و غەم و بێتاقەتی نیە ، بێزاری نیە ، راکە راک نیە ، هیچ نەرێنیەک نیە ، بەڵکو هەمووی چێژو خۆشیە

ئایا دەزانی لەناو بەهەشتدا هەرگیز وەڕەس نابیت چونکە هەموو رۆژانێکی جومعان گۆڕانکاری بەسەر هەموو مەملەکەتەکانتاندا دێت وئەوەندەی تر دەڕازێتەوەو جوانتر دەبێ بە هاوسەرەکانیشەوە

ئایا دەزانی بەهەشتیەکان هێندە دڵخۆش هەموو وتەیەکیان بریتیە لەوەی کە بەیەکتر دەڵێن (سڵاوی خوات لێبێ )

وە هێندە سەرسوڕمانن بەجوانی ئەو نیشتیمانانەی ناو بەهەشت هەر (سبحان الله) یانە



وە هێندە بەختەوەر و دڵخۆشن بەجۆرێک لەخۆشیا بەردەوام هەر (الحمدلله ) دەکەن

ئایا ئەزانی خۆشیەکی زۆر گەورەیان پێ دەگات واتە ئەوەندەی تر دڵخۆش دەبن بەوەی کە فریشتیەک دێت بۆلایان و پێیان دەڵێ پەروەردگار سڵاوی بۆتان هەیە ، سڵاوتان لێ دەکات بەمە هێندەی تر دڵخۆش دەبن

ئایا دەزانی لەچکێکی سەری ئافرەتێکی بەهەشتی هێندە جوان و بەنرخە ئەگەر هەموو ئەم دونیایە بخەملێنی ناگاتە جوانی و گرانبەهایی ئەو لەچکە

ئایا دەزانی تاجی ئاڵتوونی سەری ئافرەتێکی ناو بەهەشت نێوانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا روناک دەکاتەوە هێندە بەنرخ و پرشنگدارە ، وە بەجۆرێکە کە روناکی خۆر دەشارێتەوە ئەگەر بێت و ئەو تاجە بهێنرێتە ناو ئاسمان

سەیرم لێدێ خەڵکانێک واز لە نوێژو عیبادەت دێنن خۆیان بێ دین دەکەن

وە ئافرەتانێکیش واز لە ئەمرەکەی پەروەردگار دەهێنن خۆیان سفور دەکەن لەپێناوی دونیایەکی کاتی پڕ لە خەم و خەفەت و کێشەو مەشاکیل وە ئەم نیعمەتە گەورەیەی ناو بەهەشتەکان لەدەست خۆیان دەدەن .

بەدەستهێنانی خۆشەویستی خوای گەورە جل جلالە :

پەروەردگار دەفەرموویێت { قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ }

واتە : ( ئەی محمد بە باوەڕداران بڵێ گەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ ، شوێنی من بکەون ئەوکات الله ش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو تاوانەکانیشتان خۆش دەبێت ، چونکە الله زۆر لێخۆش بووەو میهرەبانە ).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت خوای گەورە جل جلالە فەرموویەتی : (( بەندەکەم بەهیچ شتێک خۆی نزیک نەکردۆتەوە لەمن کە خۆشەویستتر بێت لای من وەک ئەنجامدانی ئەو فەڕزانەی کە پێویستم کردووە لەسەری وە بەردەوام بەندەکەم خۆی نزیک دەکاتەوە لەمن بە ئەنجامدانی سوننەتەکان تا بەتەواوی خۆشم دەوێت )).

خوای گەورە جل جلالە دەفەرموویێت :

{ ... إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ }

(( بێ گومان خوای گەورە تەوبەکاران و خۆ پاک و خاوێن ڕاگرەکانی خۆش دەوێت )).

{ ... إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ }

(( بێ گومان خوای گەورە پشت بەستووانی بە زاتی خوا خۆی (جل جلالە) خۆش دەوێت ))



{ ... إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ }

(( بێ گومان خوای گەورە دادپەروەرانی خۆش دەوێت )).

{ ... وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ }

(( بێ گومان خوای گەورە ئارامگرتووانی خۆش دەوێت )).

{ ... إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ}

(( بێ گومان خوای گەورە چاکەکارانی خۆش دەوێت )).

{ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ }

(( بێ گومان خوای گەورە ئەوانەی خۆش دەوێت کە دەجەنگن لە پێناوی ڕێبازی خوادا بەیەک ڕیز و بەیەک پارچە وەک دیوارێکی قایم و داڕێژراو بە قورقوشم )).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (( خوای گەورە ئەو بەندەیەی خۆش دەوێت کە خۆپارێزەو دەوڵەمەندو نەناسراوە )).

عبدالله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێت : (هەرکەسێک پێی خۆشە بزانێت کە خواو پێغەمبەری ﷺ خۆش دەوێت . با تەماشا بکات گەر قورئانی خۆشویست ئەوکات ئەو کەسە بەڕاستی خواو پێغەمبەری ﷺ خۆش دەوێت ).

پێغەمبەری خوا ﷺ فێری ئەم نزایەمان دەکات کە بڵێین: ((اسالک حبک وحب من یحبک ، وحب عمل یقربني الى حبک ))

واتە : (( خوایە داوای خۆشەویستی تۆ دەکەم ، وە خۆشەویستی ئەوانەی تۆیان خۆش دەوێت ، وە خۆشەویستی ئەو کارەی نزیکم دەکاتەوە لە خۆشەویستی تۆ )). چونکە هەرکاتێک بەندە گەیشتە ئەوەی ببێتە خۆشەویستی خوا ئەوکات ناچێتە دۆزەخەوە .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (( خوای گەورە خۆشەویستی خۆی فڕێ ناداتە دۆزەخەوە )).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت :

(( ئەی گەنجانی قورەیش (بۆ هەموو ئومەتە) داوێنتان پاک ڕاگرن و زینا مەکەن ، هەر کەسێک خۆی داوێن پاک ڕابگرێت بەهەشت بۆ ئەوە )).

(( سێ کۆمەڵ هەن چاوییان ئاگری دۆزەخ نابینێت لە ڕۆژی کۆتاییدا (واتە ناسوتێت لە دۆزەخدا) چاوێک گریا بێت لە ترسی خوا ، وە چاوێک پاسەوانی پێ کرابێت لە پێناوی خوا ، وە چاوێک نوقێنرابێت لە بینینی حەرامکراوەکانی خوا )).

(( هەرکەسێک پارێزگاری لە کەسایەتی مسوڵمانێک بکات کە لە پاشەملە بە خراپە باس دەکرێت ، خوای گەورە پێویستی کردووە لەسەر خۆی کە ئەو کەسە ئازاد بکات لە ئاگری دۆزەخ )).

(( هەر مسوڵمانێک ترسێک چووبێتە دڵیەوە و ترسێنرابێت لە پێناوی خوادا ، ئەو کەسە خوای گەورە دۆزەخی لەسەر حەرام کردووە )).



(( گەر قورئان کۆبکرێتەوە لەناو پێستەیەکدا (واتە لەبەرکرابێت لەپێناوی خوادا) خوای گەورە بەئاگر نایسوتێنێت )).

## داواکردنی بەهەشت لە الله جل جلالە

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :

(( هەر کەسێک سێ جار داوای بەهەشت لە خوای گەورە بکات ، بەهەشت دێتە زمان و دەڵێت : خوایە ئەو کەسە بخەرە بەهەشتەوە . وە هەرکەسێک سێ جار پەنا بەخوا بگرێت لە دۆزەخ، دۆزەخ دەڵێت : خوایە ئەو کەسە پەنا بدە لە دۆزەخ )).

(( هەر کەسێک حەوت جار پەنا بگرێت بەخوا لە ئاگری دۆزەخ ، لەو کاتەدا دۆزەخ دێتە زمان و دەڵێت : خوایە فلان کەسی بەندەی تۆ پەنای بەتۆ گرتووە لە من خوایە پەنای بدە ، وە هەر کەسێک حەوت جار داوای بەهەشت لە خوای گەورە بکات ، لەوکاتەدا بەهەشت دێتە زمان و دەڵێت : خوایە فلان کەسی بەندەی تۆ داوای منی لە تۆ کردووە ، خوایە بیخەرە ناو بەهەشتەوە )).

أبو علاء رضي الله عنه دەفەرموویت :

(عبدالله ی کوڕی مەغفل ) رضي الله عنه گوێی لە کوڕێکی بوو لە دوعاکەیدا دەیووت :

( خوایە داوای کۆشکە سپیەکەی لای راستی بەهەشتت لێ دەکەم گەر چوومە ناوییەوە . ئەویش بەکوڕەکەی فەرموو : کوڕی خۆم گەر داوات کرد تەنها داوای بەهەشت لە خوا بکەو

پەنای پێ بگرە لە دۆزەخ ، چونکە من گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە کە دەیفەرموو : (( لە ئاخر زەماندا لە ئومەتەکەی من کەسانێک دێن زیادەڕەوی دەکەن لە دوعاو لە دەستنوێژدا )). ).

( سعد کوڕی ئەبی وەقاص ) رضي الله عنه گوێی لە کوڕێکی بوو لە دوعاو نزاکەیدا دەیوت : ( خوایە داوای بەهەشت ونیعمەتەکانی وئاوریشمەکانی دەکەم و . . . . وە پەنائەگرم بە تۆ لە دۆزەخ و لە کۆت و زنجیرەکانی . . . . سەعد لەوێدا بە کوڕەکەی وت : داوای چاکەیەکی زۆرت کرد لە خوا و وە پەنات گرت بەخوا لە خراپەیەکی زۆر ، بەڵام من گوێم لێ بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو : ((کەسانێک دێن زیادە ڕەوی دەکەن لە دوعاکانیاندا)).

وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خوای گەورە جل جلالە دەفەرمووێت: { ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ } واتە: { داوا لە خوا بکەن بە زەلیلی و بەنهێنی ، چونکە خوای گەورە ئەوانەی خۆش ناوێت کە زیادەڕەوی دەکەن}.

کۆتایی باسەکە دێنین بە دوعاکەی هاوەڵی بەڕێز ابن مسعود رضي الله عنه کە دەفەرمووێت :

* ان من دعائي الذي لا أكاد أن ادع : اللهم إني اسألك [ ايمانا لايرتد] و نعيما لا يبيد و قرة عين لا تنفد و مرافقة [نبيك] محمد ﷺ في أعلى جنة الخلد *

واتە : لەو نزایەم کە هەرگیز وازی لێ ناهێنم دەپاڕێمەوە و دەڵێم : خوایە داوای بڕوایەکت لێ دەکەم کە پاشگەزبوونەوەی بە



دوادا نەیەت ، وە داوای خۆشیەکت لێ دەکەم هەرگیز لەناونەچێت ، وە داوای سامانێکت لێ دەکەم هەرگیز تەواو نەبێت ، وە داوای هاوڕێیەتی پێغەمبەرەکەت محمد ﷺ دەکەم لەبەرزترین پلەکانی بەهەشتی هەتا هەتایی دا .

هاتمە کۆتایی زنجیرەی گەشتێک بەناو مەملکەتەکانی بەهەشت و داوا لە پەروەردگار دەکەم مەملەکەت و نیشتیمانەکانی ناو بەهەشت بەهەموومان ببەخشێت و لەو پاداشتە گەورەیە بێ بەشمان نەکات

وە خۆشتر لەو بەهەشتە ناوازەیە ئەوەیە کە الله جل جلالە بمانگەیەنێت بەدیدارو مەجلیسەکانی خۆی لەناو بەهەشتدا خۆشترینی خۆشیەکانمان پێ ببەخشێت کە بریتیە لە بینینی زاتی پیرۆزی خۆی و رازیبوونی لێمان .



## بیرخستنەوەیەك ...

لەو رۆژەدا دەبینی روخساری هەندێک لەخەڵکان دەگەشێنەوەو لەوپەڕی خۆشیدان

وە پەروەرێن دڵیانی رازی کردووە لەدوای هەوڵ و ماندووبوونەکانیان لە ژیانە کاتیەکەی دونیادا ، ئەو بەختەوەرانە لەناو نیشتیمانە هەرەبەرزەکانی بەهەشتەکاندان ، ئەو نیشتیمانانە هیچ لەغو غەڵبەغەڵب و دەنگێکی نەشیاوی تیانیە و دڵەکان و گوێیەکان و دەروونەکان تیایدا لەوپەڕی هێمنی و ئارامیدان

ئەوانە لەسەر جێگەو قەنەفەو سیسەمی ڕیزکراو و نەخشێنراو رازاوە پاڵیان لێ داوەتەوەو لە کەیف و خۆشیدان

وە و شوێنی پاڵدانەوەکانیان لە کۆشکەکانیاندا لەناو باخ و باخاتەکانی بەهەشتدایە، بەجۆرێک ئەو بەهەشتیانە چەندین سەرچاوەی ئاو و کانیاو وە رووبارەکانی (شیرو هەنگوین وشەرابە جۆراوجۆرەکان) بەژێر ڤێلاکانیاندا دەڕوات

وە بە کوپ و پەرداخ و سوراحی دروستکراو و ئامادەکراو لە ئاڵتوون و زیو شەربەت و شەراب و خواردنەوەو خواردنی زۆر بەتام و بەچێژیان پێشکەش دەکرێت لەلایەن خزمەتکارەکانیانەوە کە هەر دەڵێی مروارین لەوناوەدا بەبەردەمیاندا هاتووچۆ دەکەنو دێن و دەچن

ئەو بەهەشتیانە هێندە نیعمەت پێدراون لەهەر شوێنێکدا لە مەمەلکەتەکانی خۆیاندا بیانەوێت دابنیشن جێگای نەرم و تەنک و ناسکیان بۆ دانراوەو بڵاو کراوەتەوە.

تێبینی/ یەک یەکی دێڕەکان هەڵقوڵاویی ئایەتەکانی قورئانی شیرینە

وێنەکە دونیایە کە نرخی باڵە مێشولەیەکی نیە



تێبینی/ ئەگەر خوێنەری ئەم کتێبە بوویت هەوڵبدە کتێبەکە بە کەسانی تر بناسێنیت تا کەسانێکی تر وەک خۆت بەخوێندنەوەی چێژ لەخۆشیەکانی ناو بەهەشت وەربگرن

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

## کۆتایی

سەرچاوەکان

لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراوە پاشان لە فەرموودە شیرینەکان.

وە بۆ دەستکەوتنی سەرچاوەی فەرموودەکان بگەڕێنەوە بۆ کتێبەکەی، مامۆستای خۆشەویست م. محمد ملا فائق شارەزووری



## ناوەڕۆك

